بۆنی کفنی دایکم‌و باوکم بەسەر گێژەڵوکەی زەمەنەوە بەلوتمدا دێن..
بۆنی ئەو هەناسانە دەکەمەوە کە لەسەر مەمکی دایکمەوە دەیگرتم
ئێستاش حەز دەکەم وەك ساوایی لەگۆڕەکەیا ئەو بۆنە هەڵمژمەوە

## پێشکەشە :

**بە مەرگی صلاح جلال**

**فاكسێكی زیهنی بۆ ئێوە**

**كارێكی سەختە پێشەكی بۆ جیهانی یاخی بونو سەرشێتی خۆمو فەزای بیركردنەوەو نوسینم لە هێڵە جیا جیاكانو فەلسەفەی مەرگ بنوسم. ئەم شارایەم پێكهاتەی هەمو ئەو شیعرانەیە كەیاخیو سەرشێت بونو وەكو دیوانی (مرایا الوجود) و ( ئێشكگری كفن پۆش) و دەیان شیعر و رۆمانی ترم نەمسوتاندن، ئەمانە لە(20) جارەوە تا (50) جار نوسراونەتەوە، سەرەڕای ئەوەی زوڵمی زۆریان لێكراوە كۆی هەمو شیعرە كانمە كە دەبو بە پتر لە دە كتێب بڵاو ببونایەتەوە بەڵام ناچار بەم جۆرە 100 كتێبم لێ بڵاو كردبووە كەپتر لە 5000 ی سویسری تێچو ، كە ئەمیش بەرهەمەمی (جەنگی جیهانی سفر) كە چەند ژمارەیەكم بەچاپێكی خراپ لێبڵاوكردەوە، ئەم هێمایەم (×) بۆ جیاكردنەوەی رستەكان دانابو، كە ئێستا خوێندنەوەی زەحمەت بوبو خۆم بۆ برادەرانی كۆمپیوتەرم دەخوێندەوە، هەروەها كفن پۆشو كەون كە لەوساڵەدا تەنیا ئەو و ئێشكگر مۆری سوریان لێدرا پاش ئەوەی زۆربەی پسپۆڕەكانیان كرد بەدەیان دێڕی قرتاوەوە بڕیاری چاپی ئەویان دا،ئەویش بە هۆی ئەو بڕیارەی سەرۆكی عێراق كە نابێت لەساڵێكدا دو كتێبی نوسەرێك رەفز بكرێت . لێرەش دا ئەو دێڕە قرتاوانە (شطب) نەمان چاپ كردەوە وە ئەو شیعرانەی تریش كە بڵاوبوبنەوە لە گۆڤارەكاندا هەڵەكانیانمان چاككردوە وەبەپێی شێتی خۆم گۆڕانم لەزۆریاندا كردوە كەخۆم لەسەر كۆمپیوتەرەكە بوبم چونكە من ناسراوم بەوەی ناتوانم رستە وەك خۆی بنوسمەوە بۆیەش هەمو پرۆژەیەك پشت بەم چاپە دەبەستێت ، چونكە لەم جارەشدا كاتێك بەهۆی دڵسۆزی كاك صلاح حسن تایپەكەیم بۆهاتەوە سەیرم كرد تەواو هەڵەی زۆری تیا كراوە كاتی خۆی بۆیە جارێكی تر سەر لەنوێ تەواو بەسەریاندا چومەوە ، بەڕاست كردنەوەو ڕێك كردنەوەیان ( وو ) خنكاند**

بومی بەڕاستی چەند ڕۆژ منی کوشت ،لە زۆر ڕستەی شیعرە کانی کفن پۆش لە کورت کردنەوەدا گۆڕانم کردوە ، کە کار لە ماناو وێنە نەکات . هەڵەکانیشمان ڕاست کردوٚتەوە ،چونکە من وەك خۆم هەمویانم چاپ کردەوە چاپیش زوڵمی گەورە یان لێکردوم .ئەوانەش پەیوەندیان بەهەژاری منەوە هەبو کە لەسەر ئەرکی خۆم کتێبەکانم چاپ کردوە بەبێئەوەی هیچ پەیژەیەکم هەبێ لە ژێر چەتری دەیاها ناحەز کە بەخوێنم تینوبون رچەی سیبریای ئەدەبم شکاندوە ، دوژمنایەتی ئەوانە گەیشتۆتە ئەوەی شتی ناشیرینم لەگەل بکەن ، بەهەمو شێوازێکی دور لە سیفاتی مرۆڤ ، بەلام با ببنە شارە کوللەش من تازە لە ترسناکترین نە خۆشی کە هەمو داهێنەرێك دەیبینێت ، گەورەترین ئەکادیمیای شێتی ئەدەب دەرچوم، ئیتر من پاش ئەزمونی سی ساڵ تازە توانای نوسینم دروست کرد ، مەبە ستم نوسینە نەك وڕێنەی ناحەزەکانم لەگەڵدا . هەر لێرەوە بانگەشەی یاخی بونو سەرشێتی خۆم رادەگەیەنم بۆئەوانەش کە رۆشنبیری یاخین دەنگیان بخەنە پالّم، چونکە یان دەبێت وشەی رۆشنبیری بسڕینەوە یان دەبێت یاخی بین کە ساڵەهای ساڵە من ئەو باجە دەدەم. جێگەی شانازیە کە بە توانای لە ڕادەبەدەری خۆم توانیم جێگەو فەزاو جیهانبینینو داهێنانی خۆم بدۆزمەوە درێژەش بە ئەدەبەکەم بدەم . سەرەڕای ئەو هەمو تەنگەژەو بارە ناهەموارە خوێنەرانو رۆشنبیرانی بیر تیژ هاوڕێی فەلسەفەی مەرگم بون، کە ناچارم سەری رێزیان بۆ دابنەوێنم، بۆ ئەوانو ئەو رۆشنبیرە جدیانەی بێ سڵەمینەوە لەسەر ئەو دەقانەیان نوسیوە بڵاوبونەوەی ئەم شارایەش لە بواری رۆشنبیرییەك کە پڕ پڕە لە شمشێر و ناحەقیو زوڵم

2007/7/2

# زمانی هایدجەر

**یەکەم فاکسی ذیهنییە بۆ فەلسەفەی مەرگی ( هایدجەر )**

**ئای ( هایدجەر) گێژەڵوکەی زمانی مادە هەڵیکردوە (...)**
**هەوری ( دایەلۆژ ) و (ڕستە) پچڕا !!**
**کێڵگەی مێشکمان چرۆی بیرکردنەوەی نەگرتوە ( ... )**
**ئەم ( گومان )ە چی نیشتمانێکی فەلسەفەیە ؟!**
**چی مەحشەرێکی ئەفسانەییە ( بون ) ( ... ) ؟!**
**زمانمان لە ( نەبون )دا وێنا بوە (...) !!**
**زەنگی گەردون بە (با) ی وشە وە لێدەدرێت**
**مێژو ئاوێنەی سەرابی خوێنی بۆشایی تێدایە**
**ڕەمزی هەرەس هێنانی فیزیایە ( ... ) !!**
**زنجیرە ئاوێنەی گەردون هەڵم گرتی ..**
**هێڵی فەلسەفیانەی بون لە نەبون بە گێژاوی زمان پچڕا..**
**ئەفسانەی بون لە نەبون دا گڕوگاڵی سڕایەوە**

ئێستا هەرەس هێنانی زمان و تۆڕی ئاماژە و گریانە
چرکەی کەوتنە خوارەوەی وشە یە
ئەڤین وێنای سەرابی خوێنی هاوچەرخ و
ڕستە کفنی دڵداریە
ئەم چرکەیە تاتە شۆرمان دایەلۆژە
وشە گۆڕستانی بونە
زمان تابوتی عالەمە ( ... )

***

ئای هایدجەر گێژەڵوکەی زمانەوانی گەردونی گرت ( ... )
تۆڕی ( زمان ) چی تاعونێکی ئەڤینە ؟!!
چی فۆتۆنێکی فیزیایی دوای (با)ی نەفخە ( ... )؟!
زەنگی گەردون لەنیگایدا ئاماژەیە
وێنەی هێلکەیەکی فلیقاوە دەداتەوە ( ... )
تاریك خانەی وێنەی شۆراوەی مێژوی بون
لە زمان دا سڕایەوە
ئێستا ساتی داڕمان و کەوتنە خوارەوەی نەبونە ( ... )
هێشوی زمان زەنگی کۆتایی تێدایە
چی گومانێکی شیرپەنجەیی فەلسەفییە ئەم زمانە؟!.
هایدجەر .. هایدجەر (... ) ئەم ( زمان )ە ( ... )

***

ئای هایدجەر ( ... ) دۆژە سارای زمان خۆرئاوای گرت (...)
خۆرهەڵاتیش بە با ی وشە توایەوە (..)
زمان درەختی شەوارەیی گومانی بونە لە نەبون
چی ئەفسونێکی شیر پەنجەیی فەلسەفیە ئەم زمانە؟!
ڕستە لەزەریای خوێنی کۆرپەدا تۆماربوب

پرسیاری عەشق لە جەستەی وشەدا نێژرا(...)
ئێستا جیهان تینوی مەرگی رستەیەکە بزر بزر
وشەش مەرگی مێژوی بونی هەڵگرتوە (..)
گڕوگاڵی با خەزانی بونە لە نەبون
چی تاریکییەکی مەحشەرییە ئەم زمانە ؟!
رێی بون شەبێخونی ئەهریمەنی کۆی مێژوە
مێژو لە خومخانەی نەبون دا دەشواتەوە
هەمو وێنەیەك ناسنامەی خۆی سوتاندوە
تەنیا وێنەی نەبون لە زمان دا تۆمار بوە
زمان مەرگی بونی پێیە(...)
هایدجەر.. هایدجەر (..) ئەفسانەیە ئەم زمانە ئەم زمـ (...)
***
ئای هایدجەر چی تۆڕێکی خوێناوییە ئەم زمانە (...)؟!!
لەساتی لەدایك بوندا مەرگی ئافراند
ئەمرۆ دڵی عالەم بەسەر کفنی تەرمێکەوە نەخشێنراوە
جوگرافیای بون لە نەبون دا دەشواتەوە
ئێستا گەردون  هێشوی وشکی چرکەیەکە (...)!!
هەمو عالەم لە گۆڕی زمان دا دەنێژێت (...)
**
ئای هایدجەر ئەم زمانە گەردونی کۆتایی بونە (...)
نهێنی مەحشەری نەبون لە نەخشەیدا تۆمار بوە
لەودیو پەردەی گەردونەوە ئاوێنەی فەلسەفەی کوڕپەیەکە
لە دوای نەبون دەم دەخاتە مەمکی دایکی (...)
بەر لە بون یش ئاوێنەی روخساری جەنازەیی
هەناسەی دوای نەبون هەڵدەمژێت (...)

پەنجەرەی بون بە با ی ئەفسانە سیواخ بو
هەمو وێنە ئەزەلییەکان لە تێکشکان شۆرانەوە
کەوتنە خوارەوەو تێك شکان وێنەی عالەم
زمان رەنگی چرکەساتی نەفخی تیایە ئێستا .. ئێستا(...)
هایدجەر .. هایدجەر..ئەم زمانە ...شیرپەنجەیە..ئەم (...)
***
ئای هایدجەر(...) گێژەڵوکەی وشە رابورد (...)!!
بون و زمان بە با ی نەبون قفڵ درا
بون لە کێڵگەی حەشیشەدا شەتڵ بوە و
نەخشەی نەبون لە تلیاکدا داڕێژراوە (..)
ئای گومانی شیر پەنجەیی ئەم زمانە
رستەی فەلسەفەی سڕییەوە(..)
شفرەی زمان هێڵی بێ کۆتایی بونە
زمان گومانی شیر پەنجەی هێڵی سفرە
ئەم گومانە تۆڕی زمانێکە بە خەردەلەوە چێنراوە
رەنگی فۆتۆن و ئاماژە و هێما و وشە و گڕوگاڵ ودڵدارییە
ئەم گومانە گۆڕی زمانی عالەمە
زمان گۆڕستانی بونی تیایە (...)
هایدجەر.. هایدجەر (..) ئەم زمانە (...)
***
ئای هایدجەر(..) تەلیسمی زمان گەردونی گرت(...)
وشە گۆڕی گومانی زەمەن و بون
بون لە گومان دا قفڵ بو (..)
گومان و بون لە نەخشەی نەبون دا جوت بون
زمان گومانی نەبونی جوگرافیای بون (...)

**ئێستا زمان فیزیای تەقینەوەی فۆتۆناتە**

**ئەم زمانە دوا پەیامە (..) ئەم زمانە شیر پەنجەیە(...)**

**ئەم گومانە ئەم زمانە..بون و نەبون چی جوگرافیایەکی هەیە؟!**

**(هایدجەر).. (هایدجەر) کەوتنە خوارەوەی (زمان)ە (...)**

**زمان زەریای شتنەوەی وێنەی عالەمە!!**

**ئەم زمانە هایدجەر ..هایدجەر ئەم زمانە (...)**

**(...) ئە(...)م (...)ز (...)م (...)" (...)" (...)**

**هایدجەر.. هایدجەر ئەم گومانە (...)**

~~997/12/7~~ **سلێمانی**

**لەگۆڤاری گەلاوێژی ژمارە 1998/10 بلاوبۆتەوە**

# هەورەکانی فەلسەفە

**دوەم فاکسی زیهنیە بۆ هایدجەر**

**ئای گێژەنگی کەشە هەوری فەلسەفە هات** (...)
**شفرەی زمان رستە و وشە و حەرفی وەری.**
**درەختی مێشك رەگی بیرکردنەوەی پچڕا** (...).
**گەردەلولێکی ناوەختە خۆرئاوای گرت.**
**پێدەچێت کاروانی دورگەکانی فەلسەفە بێت؟!.**
**لە دارستانی زمانمان نیشانەی پرسیار دەکێشێ.**
**ئەم دەشتاییە جوگرافیای (شارێك) بو نەما.**
**بۆسۆی فەلسەفی ئەو درەختانەی بەرکەوتوە.**
**کە بەشێوەی مرۆڤەوە وێنا کراون** (..).
**لە دوای نەبون ی بون ە وە ئاوێنەیەکیان جێ هێشتوە.**
**چاوگێکی سەرابی لماوی دوای لافاوە.**
**ئێرە دەنگی جیهانێکە بە دەمامك ئاهەنگ دەکات.**
**سەدای پشیلەیەك لەسەر مانگەوە دێتە گوێ .**

جەستەی ئاوێتەی ئەستێرەیەکی کوژاوەیە.
بە  حیلە و فیشکە و قیژە و نوزە و میاوەوە فەزا دەبڕن.
تا شەبەردی  بون و نەبون بە شیلاوگ  سیواخ دەدەن .
چی ساتێکە مەحشەر لە زەنگیانەی نەفخیدا وێنا بوە.
وێنەی جەستەی  حەقیقەتی بون  فۆتۆ دەکات .
تونێلی دەنگە خەفەکان لە دوڕیانی ( بون )دا .
بە لێك ترازانی ئەستێرەوە تەریب کرا.
با یەك گێژ دەخواو  پەڕۆی بوکێنی شار دەپێچێتەوە .
ئەم خاکە  شارێك  بو  با  { } تەفکیکی  کرد ... .
**
ئای ڕۆژانی زەنگ و ئاژێر  ...  بای گشتگیری ( ... ) .
منارەی شار کەوتنە  لەرزە !!
دارێکی ئەبەدی لە کاکێشان رەگی دانا .
گەلای وێنەی کۆرپەکانی کافرۆشی بو.
ئاسمان ڕەنگی سور بو  گۆڕا  سپی  شین  بو
بەشیرو ژەهر و هەناسەی ئەستێرە و مانگ .
لەمرۆڤدا رەگی شیرپەنجەیان رواند ( ... ) .
ئای لەو ساتەی پەراسو بە ( با ) پڕ دە بو.
با یەك ئەم شارەی خستە ناو فەزای حەقیقەت گەڕاوە .
ئاژێرەکانی فەلسەفەش بە قوڕاوێك سیواخ دران
شوێنەواری ( بون )ی ئەم شارە .
تەنیا جێماوەی دایەلۆژێکی فەلسەفییە.
گێژەڵوکەی حەقیقەتی تەکنیکی پێچایەوە..
هایدجەر.. هایدجەر بڕوانە جوگرافیای ناحەقیقی وێناکرد و

حەقیقەت ماهیەتی ( بون )ی خنکاند ( ... ) .

**

چی وشەیەك لێرە ماوە, ناوی شار بێ؟! ( ... ) .
کێ لەسەر بەرد رستەی ئەڤینی خوێندەوە ؟
لە درەختی ئاسمانەوە چاویلکەیەك فەزای پێوا.
با یەك هات و با یەك رۆیشت..
تەلی تۆفانی فەلسەفە بون و نەبون ی هەلْمژی.
نەبونەکەی کامۆ ژەهرەکەی سوقرات ی رژاند .
چاوی سارتەر بەوێنابونی بیکیت ەوە خامۆش کرا .
سارتەر پەیژەی بون ی بۆ هەور هەلْزنی .
دیکارت و هێگەلْ وهۆسرلْ فینۆمینۆی نەبون یان شیتەلْ کردەوە.
هایدجەر نوقمی حەقیقەت ی بون و نەبون بو.
ئێستا ساتی کەوتنە خوارەوەی زمانی بون نەبون ە .
لە رایەلْی ئەستێرەوە بە تیشکی چرا نەوتینەکان ئاوێتە بون.
کێ وجودی خۆی بیرماوە ؟!
هەتا حەقیقەتی ئاگرێکی ئەم شارە بگێرێتەوە.
کێ جوجکەیەکی بینیوە بە دەم پشیلەیەکەوە قرخەی بوبێ؟!
یا مرۆڤێك لە ساتێکدا ئەلْقەیەکی بوکێنی دیبێتەوە؟!
ئاوێنە فەلسەفیەکانی ئەم شارە حەمامێکیان تیادا هەبوە،
رەگی شەهوانی مرۆی ئەستێرەکانی نیشان دابێ؟
دەبێت لەم شارەدا کچێك بوبێ مرۆڤ بوبێ؟!
پێدەچێت لە شارێکدا تەنیا مەلێك نەبرژابێ..
تەنیا و تەنیا .. باڵەفرێك ( ... ) .
ئەم بۆشاییە شارێك بو حەقیقەتی بون ی نەبو (...)

**

ئای تۆفانی حەقیقەتی کەوتنە خوارەوەی ئەستێرە ( ... )

لەم شارەدا تاقە نیگایەك نابینرێت کاول بکرێت..

تلیاك و جگەرە و حەشیشە و چاو هەناسە یاخی بون و

بە فەزاوە جوگرافیای نەبون یان نەخشاندوە.

شارێك نەخشەکەی با بردی.

تەقنییەی فەلسەفە لە حەقیقەت ی هایدجەردا پێچایەوە ( ... ).

***

ئای مرۆڤە مۆمیاکانی چاخی سفر ( ... ).

چاوتان لە درەختێکی وشکە لە خۆرهەلآت .

گوێتان لە دەنگێکی مردوی خۆرئاوایە.

گۆڕێکی ( بون ) لە ( نەبون )دا بخاتە ( بێشکە ).

تاقە دەنگێك لە خۆرهەلآت دەرچو .

مردوی نەبون لە وجود دا زاریان جولآند (...)

ئێستا فەزا بە نەبون ێك لە حەقیقەت وێناکرا.

تەنیا هەورێك چەتری شارە.

خاکیشی تەنیا هەورێکی وێنا بوە.

دەنگی پشیلەیەك لە بۆشاییەوە دەردێت تەنیا و تەنیا.

جەستەی بەقولاپی ئەستێرەی شار هەلواسراوە.

چی فەزایەك جوگرافیای بون لە حەقیقەت دیاری دەکات (...)؟!.

نەخشەی شاریش لە مەمکی بەرد دلۆپەی کرد.

ئەویش بە تەقنییەی فۆتۆن ون بو سوتا ( ... ) .

ماهییەتی بە شیری زوحەیل و شیلاوگی کا فرۆشی تێکەلّ کرا ..

لەگەلّ هێزی گەردەلولی شارا ون بون ( ... ) .

***

ئەی ئەوانەی لە نەبون ی شاردا مۆمیان ( ... ) .
جەستەی خۆتان بە جوگرافیای شار بپێون بۆ نەخشەیەکی کۆتایی.
ئێستا ساتی ئاگربارانی فەلسەفە و بۆسۆی فۆتۆنی گەردونە.
مارکس ئیفلاتونی نوسی و نیتشە نەمرود.
هایدجەر مردو زمان لە حەقیقەتی بون و نەبون فەزای پێوا
چرای فەلسەفە بە دار ئەلەتریکی بون ە وە کەوتە لەرزین ( ... ).
تۆڕی ( زمان ) توشی شێرپەنجەی تاوان بو.
بایەکی ئەبەدی دارستانی شاری ماڵی .
ماجەلان چوەوە ناو دەریا.
زەرادەشت بەداڵێکەوە منارەی گرت ( ... ).
فیرعەون و هێتلەر بە جوتە نەخشەی بون یان کێشایەوە .
گومانی حەقیقەت لە دەنوکی قەلێکەوە دەرکەوت .
تەنیا نەخشەی جەستەیەك بو وێنا بجەستەکەی ئەیوب .
گۆشتی بە ( با ) پڕ دەبوەوە ( ... ) .
کێ دەتوانێت فاکس بۆ دارستانی ئەستێرە بکات ؟!
حەقیقەتی مەرگی زمان لە حەقیقەتی ماهیەتی بون دیاری کات.
فەرمون زەنگ بۆ ئەدیسۆن و ئەنجلس لێدەن.
زمان نیشتەجێ بونی بونەوەرە هایدجەر .. هایدجەر .
قروسکە وحیلە وجریوە وهاوارلە جەستەی ناحەقیقەتی تێکەڵ بوە.
لە دوای زمانی چاخی سفر لە بێ زمانی بەجێ ماوە .
کێ ئەم زەوییەی جارێك دیوە؟!
وێنەی شفرەکانی زمان بێنێتە یاد .
کەسێك هەیە تەنیا حەرفێکی بیر مابێت؟

تا له ئاگری وشەدا خۆی له ماهییەتی ناحەقیقی بسوتێنێت.
بون و نەبون تەختە سڕی فەزای شاریان هەڵگرتوە.
گڕوگاڵ و لایەلایە جێگەی ( بون )ی دیاری دەکرێت .
جوگرافیای ( بون ) له تاریکخانەی گەردونەوە شۆرایەوە .
***
درەختی فەلسەفە هات و دورگەکانی فیزیای شین کرد ( ... ) .
تەنیا ڕێژنەی دڵۆپە شیرێکی مەمك رژایە خوار.
سیمۆتیکای مەرگ به گەردونەوە کەوتە زەنگۆڵ
تۆڕی فەلسەفە به (بون نەبون)ەوە گرێ درا (...)
بون له (نەبون) حەقیقەتی (بون)ی ونبو
ئێستا فۆتۆن له (بون)دا نەفخ دەبێت
گەردون به هێڵی فەلسەفەی تابوتێکەوە تەریب بوە.
جاجمەکەی (هایدجەر) هات و شاری پۆشی.
هەزاران هێلکەی فەلسەفە به هەورێکەوە تێکەڵ کران.
حەقیقەتی (بون نەبون) یان بەشیلاوگەوە وێنا کرد (...).
به شەمەنەفەری فەلسەفە لەسەر هەور گۆڕیان هەڵکەند (...).
***
ئای حەقیقەتی بون و نەبون له تۆڕی فەلسەفە ون بون (...).
تەقنییەی (با) فەزای شارێکی هەورینی داڕشتەوە.
فەزای ڕۆح له فەزای فۆتۆناتدا گۆڕستانێکیان پێك هێنا .
هێڵەکانی فیزیا به زەنگۆڵە ئەبەدییەکان ئاوێتە بو.
زمانێك بو به گۆڕستان رەمزی هەرەسهێنانی سڕییەوە.
با یەك هات و (با) یەك فەزای گەردونی گرت.
به دوای تۆڕی (نەبون) و حەقیقەتی (بون)ەوە ون بو.

زمانێك جێ ماوەی ئەو مرۆیە مۆمیا بوانەی چاخی سفر بو.

لەم شارەدا شوێنەوارێك هەبو.

بە با یەکی ئەبەدییەوە سڕایەوە.

شارێك هەبو جوگرافیاکەی لە (نەبون)دا تۆمار ببو.

ئەم جوگرافیایە شارێك بو(...).

ش – ا – ر–ێ – ك  –  ب – و – و

(...)                                        1990/8/8

---

لەگۆڤاری رامان ژمارە: 39ی 1999 بلاوبۆتەوە

کاك هوشیار شێخ أنور وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لە کتێبی سقوگ الکون دا بلاوبۆتەوە

# فەلسەفەی مەرگ

**سێهەم فاکسی زیهنییە بۆ فەلسەفەی مەرگی هایدجەر**

**ئەم زەوی یە سێوی ژەهرو هێمای سڕینەوەی (بون)ە (...)**
**درەختی مێشك گەڵای (گومان)ی گرتوە**
**لەم خاکەدا ناسنامەی تۆو ئێمەو ئەوان و نیشتمان**
**ڕەمزی ذیهنی گەڵایەکی کۆچ کردوە**
**ڕەنگی پیاڵەیەك (ئاو) دەدات**
**ئێرە کشت و کاڵی ژەهری فەلسەفەی مەرگی ئێستایە بە سەرەتا(...)**
**گەڵا ڕێزانی زەمەن هات !!**
**تۆڕو گەڵای (زمان) و (بون) بە گێژەنگی (با)وە ون بون**
**چی ساتێکە فەزای تلیاك جوگرافیایەکی لە نەبون پێك هێناوە (...)؟**
**لە فەلسەفەی مەرگی (بون)دا نیشتەجێیە**
**ئێستا ساتی قەدەرێکە بەر لە فۆتۆن (...) بەر لە هەرەس(..)**
**دەشت و چیا باڵایەکیان لە (ئاو) هەیە**

جوگرافیای (بون) به درەختی ژەهری فەلسەفە ڕەنگ بوە
ئاوێنەی ناحەقیقی (ئێستا) بە حەقیقەتی (سەرەتا)وە (..)
فەلسەفەی مەرگ لە فۆتۆنی (داهاتو)ا شەتڵ دەکات
لێرە ڕۆحی بەرلە (بون) بە شاڵاوی ماهییەت ئاوێتە دەبێت
ساتی (قەدەر) فۆتۆنی عەشق گەردون دەگرێت..
ئەم زەوییە تۆوی خەردەل وشێرپەنجەیە بۆ نیشتمانی فەلسەفە (..)
***
درەختی زمان لەم زەوی یە بە شاڵاوی (با)وە ون بو(..)
گەڵابە سیمۆ تیقای مەرگەوە فەزای ڕەمزی مێژویان شی کردەوە
ڕۆح بە ئاوێنەی فەلسەفەی مەرگ وێنا بوە
گۆڕی شوشە فەزای فەلسەفەی پێك هێنا..
گەڵای (وجود) کەوتنە خوار!!
لێرە) پەنجەرەی فەلسەفە قفڵ بون و کرانەوە
تۆڕی بێ زمانی لەزمانی ذیهنی گەڵایا نەخش کرا (..)
شوشەی شکاوی با وێنەی بون ًکی بەر لە نەبون بو
نەبون یش پارچە ئاوێنەی چەند سەدەیەك بو لە قوڕاو
شوێنەواری ( بون ) لەسەر هیچ گەڵایەك ناوی نەبو
ئەو زەنگانەی گەڵای درەختی ( بون ) یان پێك هێنا
نیشتمانی فەلسەفەی مەرگیان بەڕۆح کێڵا ( ... )
هۆسرڵ ئاوێنەی فرۆید ی بۆ سەرەتا گەڕاندەوە
نیتشە نەمامی نەبون ی لەکشتوکاڵی گوماندا رواند
لەدوای هێڵی بێڕەنگی درەختێك لە ( گومان ) سەوز بو
فاکسی ذیهنی ڕۆحی ( هاید جەر )یان دەکێشا ( ... )
تۆوەکانی فەلسەفە لەم خاکەدا زمانی فۆتۆنیان کردەوە

بەترومپای یەکەم ژەهری سەرەتایی
دارستانی درەختی سێوی ( حەوا )یان پەرش دەکرد
ئەم خاکە خۆڵی زمانی ئاوی هێرقلیتس و گەڵای داروێنە
من و تۆ و ئەوان گەڵای مەیمونی ئەودرەختە ژەهراوییەین ( ... )
سەیری خۆت کە لە ئاوێنەی ئێمە و بون و نەبون
هەمو وێنەیەك سیمایەکی مەیمونی گرتوە ( ... )
دو جار بەئاوێك شۆران و بون بە گەڵای ذیهنی درەخت
دارستانی حەقیقەتی تەقنییەی ( بون )ی سێو ژەهرە !!
لێرە لە نیشتمان ئاو دو جار بون بە ژەهرە دەشوات ( .. )

**

ئەم زەوی یە ئاوی ڕۆحی فەزای جێگەی بەر لە ( بون )ە ( .. )
فەزای سیمیای فەزایەکە لە فەلسەفە پێك هاتوە..
تەنافی ڕەمزی مەرگەسات بەدرەختی فەلسەفەوە ڕایەڵ بوە
لێرە تەنیا دلۆپێك شیر ناسنامەی زمانی بەر لە بون ە
بەدار ئەلەتریکی بون وە دەبێتە لانکەی میکرۆسکۆب
چیای هەور لە گۆڕستانی شوشە پێك هات
شەتڵی دیالاکتیك هەوری ڕۆحی ( بون )دەڕوێنێت
لە ئاوێنەی نەبون ەوە حەقیقەتی فەلسەفەی مەرگ وێنا دەکەن
ئەم ( زەویە ) نیشتمانی شەوارەی ئەلەتریکە
چوار ڕەنگی فۆتۆنی فیزیا هەوری بون یان پێك هێناوە ( .. )
ئای لەو گێژە لۆکە سەرتا سەریەی ( زمان )
خاکی ( زمان ) بە ( گەڵا )ی ( گومان ) داپۆشرا
لەم کشت و کاڵی ئەلەتریکە ئەڵغامی ڕۆح تۆو چەن بوە ( .. )
بە میزەڵانی تابوتەوە یاری بە گەڵای جەستە دەکەن
لەم ( ئێستا ) یە هەمو مادەیەك بو بە ( ئاو )

تەنیا دار سێوەکەی حەوا سێبەری بون و نەبون ە
گەڵایەکی عەشقی ئەبەدی ئیفلاتون ە لە فەلسەفە
ئەوی تریش ژەهری فەلسەفەی ( سوقرات )ە بۆ فەلسەفە
لێرە فەلسەفە لە فۆتۆنی فیزیادا دەتەقێتەوە
هەر گەڵایەك ڕەمزی کەوتنە خوارەوەی عالەمێکە
لەساتی فۆتۆندا جیا دەبنەوەو پێك دێنەوە
لێرە ) هەموعالەم لەتەنیا درەختێکدایە تەنیاو تەنیا
درەختێك فەزای سیمیایی فەزای عالەمە
ئەم زەوییە گوڵدانی فەلسەفەی مەرگی تراژیدیای وێنەی بونە ( .. )
شێرپەنجەیە ئەم زەوییە( ..) شێرپەنجەیە ئەم زەوییە( .. )

***

درەختی فەلسەفەی مەرگ نیشتمانی زمان ی شین کرد ( .. )
وێنەی زمان لە خومخانەی مەرگی فەلسەفە وێنا بو..
ئێرە شارستانی جەستەیەکە لەدوای مەرگ زمان بگرێت
ئای کەشە هەوری شیلاوگی گومان ی سکی فەلسەفە؟!
دڵۆپەیەك بەگەردەلولی ( با ) خنکا ( .. )
هەرگەڵایەکی درەختی ئەم تۆفانە ناسنامەی عالەمێك بو بزر بزر ..
لە فۆتۆن و زنجیرە و نەخشەکانی فەلسەفەوە سروشتی گرتبو
گەڵای کفنی زمانی هایدجەر سەوزبوەو
لە درەختی فەلسەفەی مەرگا بون ی شین کرد
بای گشتگیری فەلسەفە هات کفنی نەبون ی ڕامالّی
گەڵای وێنە مەیمون بە وێنەی نوئێل دوە ترەکینەوە
ڕەمزی گۆڕێکی شوشەیان پێك هێنا ( .. )
کێ ناسنامە و بون و زمان ی خۆی دەوێت گەڵا بگرێت ..؟!
ڕەنگ و شێوە و ڕەگەزی مەیمونی باوکی تیا ببینێت
گەڵایەك لەم بونەڕەمزی گەڵایەکە لەنەبونی من وتۆ وئەوان وئێمە ( .. )
ئێستا ساتی کەوتنە خوارەوەی گەڵایە بۆ وێنەی ( بون )

وێنەی عالەم لە کاژێری تاشەبەردا ڕەنگ هەڵدەگرێت ( .. )
**
گەڵای فیکری ئەم زەوی یە بەدرەختی فیزیا لول بو ( .. )
با ی فۆتۆن فەلسەفەی گەڕاندەوە بۆ سەرەتا
هێرقلیتس  تێکەڵی گەڵای فۆتۆنی  ئێستا  بو لە  سەرەتا
ئێستا  زەمەن بەهێڵی فەلسەفە قفڵە
عالەم دو جار بە ئاوی زەریایەك شۆرا ( .. )
گێژاوی یاسای نیسبی هات
گێژەڵوکەی ئەزەل سکی مێژوی پڕکردەوە
گەڵای زمان بە ساتە وەخت گەیشتەوە
ئێستا مەرگ لە پەرداخی فەلسەفەدا نیشتەجێیە
زەمەن + زەمەن  ( .. )
ئاوێنەی منداڵی لە چەرخ و فەلەقی فەلسەفە وبون و نەبون دایە
فرۆید  لە زەریای ( نەبون ) شۆرایەوە
هایدجەر  لە کفنی گەڵای ( زمان )دا نێژرا
گێژەڵوکەی زمان بە ئاوێنەی فەلسەفەوە ڕەنگی هەڵگرت
گەڵای عالەم بۆ درەختی یەکەم باوك گەڕایەوە
ئادەم حەوا ی کوشت و سێویش  ئادەم ی وشك کرد
ئێستا و ئێستا دار سێوێك نیشتمانی فەلسەفەی مەرگە
ئەم زەوی یە درەختی فەلسەفەی مەرگی بون ی پێك هێناوە
**
هاوارێك دێت لەدوای فۆتۆنی کۆتایی سەدای پشیلەی کێویە ( .. )
بە سیمیۆتیکای تۆڕی زمانی ( نەبون ) تێکەڵ دەبێت..
جوگرافیای ( بون ) لە بەرگی فەلسەفە دەدڕێت
گێژەڵوکەی فەلسەفەش بەسێوەکەی نیۆتن ەوە یاری دەکا ( .. )
بە دار سێوی دایکە حەوا  تێکەڵ نابن

لەگەڵ دیالاکتیکی (مارکس) باسکە دەکەن
با ی گشتگیری فەلسەفە هات ( بون )ی پۆشی ( .. )
زەریای زەوی بەسێو ژەهری فەلسەفە پڕ کرایەوە ..
ڕۆح لە جەستەی سێوەکاندا شەتڵ کرا
مێژو بەسێوی ژەهری نیسبی سفر بوە
ئەم زەویە هاوار و روخسارو ( بون )ی خنکا ..
سێو و ژەهر گەیشتنە هەور ..
ئێرە خاکی کشت و کاڵی فەلسەفەی مەرگی بون نەبون ە
کشت و کاڵی فەلسەفەیە
( .. ) فەلسەفەیە ( .. )
( ... ) ( ... )

---

لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە 16/ 1999 بڵاوبۆتەوە
کاك هۆشیار شێخ أنور وەریگێرشاوەتە سەر زمانی عەرەبی ،لە کتێبی سقوگ الکون دا بڵاو بۆتەوە.

# میتامەرگ

## چوارەم ڤاکسی ذیهنییە بۆ ( فەلسەفەی مەرگ )ی ( مارتان هایدجەر )

گەلای (گومان) درەختی (فیکر)ی پۆشیوە (.....)
گومان بکە (... ) لە (وێنە) و (ئاماژە) و( هێما)
ئەم زەوی یە تاریك خانەی (وێنە)ی بێشێوازی (بون)ە.
وێنەی ذیهنی شێرپەنجەی (بون) لەفەلسەفە وێنا بوە (...)
رەنگی (با) و(هەناسە) و(ئەڤین) و (ئاو) شێوەی ناشێوەیان وەرگرت
گێژەڵوکەی (میتازمان) فەزای فەلسەفەی گرتەوە.
چرۆی (حەرف) و (وشە) و(رستە) و(وێنە) وەری!!
وێنەی (خود) و(ئێمە) و (ئەوان) و (نیشتمان) (..)
لەکفنی رستەیەکی فەلسەفیدا شۆرانەوە
کە فیکرناتوانێت واتاوئاماژە و وێنا کردنیان دەربخات (...)

لەم خاكەدازمان رەنگی هەناسەو دەنگی نەبونێك وێنا دەكات
بەشەوارەی گۆڕی شوشەیی فەزای (وشە)
تۆڕی (ئاماژە)و (وێنە) و (بیركردنەوە) پچڕا (..)
گەردەلولی (حەرف) فەزای (زمان)ی میتازەمەنی گرتەوە.
پەپولەی مەرگ لەفۆتۆنی فەزای (فیكر)انیشتەجێ بو.
بو بەزەمەنی میتامەرگ (..)
شاری گێژەڵوكەی (وێنە) و(روخسار)
بەتەنیا درەختێكە وشە ی گەڵا ژەهری میتاوێنەی دەركردوە.
ئێرە نیشتمانی (میتامەرگ)ە (...)
**

ئەم زەوی یە دوا وێنەی خود و رۆح و بون ی تیایە (...)
فەزای فۆتۆن بە نەفخەوە میتا رۆح ی رەنگاڵە كرد.
توخمە هێلكەی نەبون بە روخسار و وێنە رەنگ بو!!
خێوەتی فەلسەفەش لە میتازەمەنی نەبون دا كرایەوە (..)
تەنیاو تەنیا هاواری مریشكێكی كڕ لەدوایەوە دەرهات.
شفرەی (زمان)ی لە هێلكە وڵەی (زەمەن) دا سڕیەوە.
ئەو هێلكەی عەدەمییانەی لەفەزای فەزا ناشێوەییەكانەوە.
بون بە ئیمپریالیەتی ئەنتۆلۆژی میتامەرگی فەزایی (ون
ئێستا میتازەمەنی فەزای ئەنتۆلۆژی هێلكەی فەلسەفەی مەرگ.
گەڵای نیتشە دەكەن بەنامەی قەصدیە بۆ زەرادەشت
قولەیەكی ئاسمانی بۆ (هۆسرل) دروست دەكەن (..)
قەلە رەش لەسەر زەمەنی میتا مەرگی فەلسەفە هەڵفڕی!!
كۆلارەی زمان یاری فەلسەفەی بە حەرف پێك هێنا
لەم ساتەدا هەڵماتی فەلسەفە جۆكەرە (..)
وێنە لەشوێنەواری گۆڕستانی فەلسەفە دەشواتەوە
هەمو (بون)ێك لەمیتا (نەبون) وێنا بو (..)

گۆڕستانی شوشەی وەهم بە (وشە)یەك وێنا ببو
گۆڕی (نەبون)ی لەفەلسەفە هەڵکەند (..)
زەمەن لەچرکەی بەر لە (بون) و دوای (نەبون) پچڕا.
شریتی فەلسەفە لەگۆڕەوە بۆ گۆڕ ون بو..
مارکس بەدوای جەدەلیەتدا هەزار مێردی پکشنی
ئەنجلس کەشتی (ماجەلان)ی خستەکار.
کۆلارەی (هێگەڵ) بۆ سێوەکەی (نیوتن) هەڵدرا (..)
مێژو تەنیا کەللە سەری هەزارەی پێنجەمی (هابیل) بو.
بۆ چەقی نیوەی زەوی دەخولایەوە (..)
بای زەیستانی فەلسەفە لەفوەکەی (مریەم) ەوە هات.
درەختی (بیر) و (زمان) و (روخسار)ی وەراند!!
زمان لەبێ ڕەنگی (بون) توایەوە (..) تێکەڵ بو بەقوڕ (..)
کاژێری فەلسەفەش فۆتۆنی فیزیایی (زمان) ی بڕی.
بون بو بە کاژێری با یەك کەزنجیرەی زنجیرەی پساند.
لەم خاکەدا (زمان) تەفکیك کراو (فەلسەفە) سەوز بو
فەزای فەلسەفەش بە هەناسەی ئیمپریالیەتی ئەنتۆلۆژی ڕەنگ بو.
ئێرە نیشتمانی (میتامەرگ)ی فەلسەفەیە (...)

***

گومان بکە ...گومان لە روانین و وێنە وروخسار و روناکی...
چی گەڵایەك مەرگی فەلەسەفەی لەفەلسەفەی مەرگ هەڵگرت؟
درەختی (سدرە) سارای (سیدرا)ی میتازمانی پۆشیوە.
گەڵای زمانی (سیدرا) وەری (...).
گۆپکەی فەلسەفەی مەرگی سوقرات و حەرفی ئیفلاتونی دەرکرد (..)
هێگەل لەهەزارەی هەشتەمی (زمان)دا هاتە بون.
مارکس لەگەڵای ئەبستمۆنی (بون)دا نێژرا (..)
ژیان لەسیپاڵە زەیستانیەکانی فەلسەفەی مەرگ لەدایك بو.

بورجەكانی شار بەخشتی فەلسەفە رەنگ كران (..)!!
ماهییەتی حەقیقەتی (بون) پرسیاری مەرگی بزر كرد.
لەتورەكەی حەقیقەتی (بون) ئەفسانەی زەمەنی خۆی شاردەوە
هولدرلین سەگێكی ئاوی بۆ چەرخی سەرەتا بردەوە.
هیرقلتیس بەئاوی چەرخی بیستەم لەهەزارەی دەیاشتی (..)
من مرۆڤێكی (دازاینیم) لەدایك بوی درەختی (حەوا)
بەبیرە سەرابییەكانی (نەبون)ەوە رەنگ بوم
بەدوای زەمەنی (هیرقلتیس)دا دەگەڕێم (..)
كێ دەتوانێت ناونیشان و رەگەز و مێژوم بدۆزێتەوە (...)؟!
من لەدەفتەری (هولدرلین) یاری بەسەگێك دەكەم.
سەگێك وێنا بە (من) و (ئێوە) (...)
ئێمە یەك وێنا بە وێنەی (سەگ)
فەرمو لەو ئاوێنە فەزاییەوە لە من وخۆت و (ئەو) بڕوانە (...)
سەگێك هەمو رەنگێكی هەڵگرتوە.
دەمێك شەراب دەخواتەوەو ساتێك (ئێسقان)
كەڵبەی ددانی مرۆڤەو لێوی شفرەی (فیل)
بەسەر دێبەری شەتڵە حەرفیەكانی فەلسەفەی مەرگدا دەپەڕێتەوە (..)
ساتێك گیان دەداو زیندو دەبێتەوە!!
سەگێك وێنەی هەمومان و وێنەی خود ی هەڵگرتوە.
وێنەی من و تۆ و ئەوان و ئێمە و ئەوانی دواترە(..)

***

گومان بكە لەساتە ئەفسانەییەكانی بون لەرۆشنایی چاویلكەیەك (..)
گێژەڵوكەی (نەبون) بورجی فەزای خستە لەرزە.
ئاسمانی شار پڕ بۆ پەشمینی زمانی شیرپەنجەی نیشتمانێكی وێنایە.
وێنا بە كەڵبە و هەناسەی پشیلەیەكی كۆتایی (..)
پشیلەیەك بەڕوخسار سەگ و بەماهییەت (..) پشیلە.

ئێستا گەلاَی فیکر لە میتۆلۆژیای مەرگ دا هەلَدەوەریێت (..)
هیچ وشەیەك بۆ وێنە بونی جەستەی (تۆ) سەوز نابیّ.
ژیان هێمای مەرگە و مەرگ وێنەی تۆ یە (..)
گەلاَی (سیدرە) زمانیان لەکفنی خۆیان داشت
تەنیا گڕوگاڵی رستەیەکی فەلسەفە زمانی گرت.
گومان لە ساتەی ئارکیۆلۆژیای بریسکە تابوتی بەر لە بونی نەخشکرد.
میتا مەرگی جوگرافیای فەزای مەرگی تیا جیّنشین بو.
ئەم شارە بەقەدەرێك درەختی (زمان)ی هەلَوەری.
فەلسەفەی مەرگی (بون) تەفکیکی کرد (..)

**

گومان بکە (...) چرکەی گومان لەسەر مەرگی دوا پرسیارە (..)
دازاین چی قەدەرێکە لەکۆتایی فەزای فەلسەفەی مەرگ.
لە دەرەوەی بەهای واتای (زمان) نیشتەجیٚ یە.
ئەو پرسیارانەی لە (نەبون)ی فەلسەفە لەدایك بون.
ئەو حەرفانەی کە ناتوانین بیانخەینە سەر شفرەی زمان (..)
ئەو وشانەی لەدرەختی (فیکر) ماندا سەوز نابن (..)
ئەو (وێنە) ئەزەلییانەی کە توانای بینینیانمان نیە!!
بای زەیستانی فەلسەفە تەنیا کەللە سەرێکی بەجیّهێشت (..)
گوێچکەی (جەنگیزخان)و لوتی (مارکس)ی تیا شەتلّ بىو.
چاوی (ڤلادیمیر پۆتین) و مێشکی (ئیفلاتونیان) هەلّگرتبو (..)
دەمارەکانیشی بلوێنەها تۆوی مرۆی گرتبوە خۆی.
هەریەکەی بەجەستەیەکی مۆمیا وێنا ببو (..)
بەوێنەی زەمەنەوە فەزای (بون) یان پۆشی
لە فیکرماندا تەنیا وێنەیەکیان هەلّنەگرت (..)
بە تابوتی گومانی دازاینی گۆڕستانی زمانی پرسیاریان پێك هێنا.
حەقیقەت بەتەلبەندی دازاین ئەفسانەی نەبونی کردەوە (...)

نەتەقنیە و نەحەقیقەت پرسیارەکانیان نوسی یەوە.
نەپرسیار فەلسەفەی مەرگی داگیر کرد (..)
پرسیاری ئێمە پرسیارە لە (وشە) و (حەرفە) تواوەکان.
گەڕانە بەدوای جنیالۆژیو وشەی (بون)
ئێستا ئەو پرسیارانەی کە (فیکر) تینویانە شێوەیان نیە (..)
ڕەنگیان وەکو ڕەنگی ورچێکە سەگ بێ.
وەکو پشیلەیەکە مرۆڤ بێ (..)
کێ دەتوانێت هاوار بکات؟!
یان تامی مامرێکی ئەمریکی بچێژێت.
ئەوە سێوێکی بەر لە (بون)ە و درەختی فەلسەفە گرتویەتی.
ئەوە کچێکی نیاندەرتاڵە و بوکی هەزارەی سێیەمە (...)
بیرکردنەوە لەومێژو زەوییە نەگریسانەی کە ناتوانین ناویان ببەین.
لەم نیشتمانەدا (زمان) تۆڕی فەلسەفەی مەرگ دەگرێت.
بیرکردنەوە لەمەرگی (تۆ) بیرکردنەوەی نەبونی (من)ە.
بیرکردنەوە لەکەللەسەری کچێکی بێ جەستە (..)
گەڵای ئەو ڕستە هەورییانەی فەزای مەرگی (عالەم)ە.
ئەمڕۆ کەللەیەك فەزای پۆشی ڕەنگی سەگێك دەداتەوە.
تەنیاو تەنیا کەللەسەرێك ڕەنگی هەمومانی هەڵگرت!! (..).

***

گومان بکە (..) لەساتە ئەفسانەییەکانی میتا پرسیار (...)
لەو وێنانەی وشەیان لەسەر زمانمان بزربوە.
من) بیر لە (تۆ) و (ئێمە) و (ئەوان) و (نیشتمان) دەکەمەوە.
بۆ شێوازی بەر لە (بون) دەگەڕێمەوە (...)
درەخت (فیکر)ی وشك کردو گەڵای مندالّی گرت.
مندالّ دان ئەتۆمی چەرخە نەوتینەکانی نەبون گڕ دەدات (...)
سەفەر تاسی شەهوەت لەکەوتنەخوارەوەی (زمان) پڕ دەبێت.

گەردون لەپوزەوانەی تەنیا مەلێکدا هەناسەی هەناسەیەکە.
هەناسەی بایەکی زەیستانی یە چارۆکەی بوکێنی گێژدەدا (..)
کەسێك نیە لەم خاکەدا فیکری بە (وشە) تەفکیك نەکرابێت؟!
سنوری پزوی مەلێکی فەزای فەلسەفەی مەرگ (..)
حەقیقەتی تەقنییەی (بون) حەقیقەتی ماهییەتی کوژاندەوە.
ئەم شارە بەتۆفانی فەزای (زمان) کوژایەوە (..).
***
گومان بکە (..) لەچرکە فیکرییەکانی کەوتنە خوارەوەی وشە(..)
ئەمرۆ (زمان) بەبای نەفخی تەریب بوە.
پرسیار لەشێوازی بون یێك کە نەبون ی تەفکیك کردوە.
مندالێك مرد زنجیرەی (وشە) خنکاندبوی.
ژنێك کوژرا کۆرپەیەك لە سکیا گریا (..)
دوا جەستەی (بون) بەچەقۆی (حەرف) سەربڕا
لەم خاکەدا (رستە) پەتی سێدارەیە.
زمان) گێژەلۆکەی مەرگە (...)
لەم (فیکر)ەدا (زمان) زەریای فیکری (مەرگە)!!
هێرقلێت بەناوی هەزارەی هەشتەم هێگەلی شت.
چاوشارکێی زەمەنە گۆڕاوەکان لەکوێی تەنیا چرکەیەکدا.
دازاینی رۆح تاریکستانی (بون)ی گرت.
نیشتمان بە (حەرف)ەکانی (نەبون) نەخش کرا (..)
بەو وشە ژەهراویانەی بەرەو فەزای نەبون گێژبون.
لێرە تونێلەکانی (نەبون) روناکن وەك رۆحی پەپولە.
لەم خاکەدا نەبون شارستانیەتی حەقیقەتی میتا بونە (..)
***
گومان بکە (..) لەو حەرفا نەی حەقیقەتی تەقنییەی بون ن (..)
ئەم شارە لەزەریای (وشە) و (حەرف)و (ڕستە) شۆرایەوە.

بەگڕی گڕکانی (زمان) سوتا (..)
کێ ناسنامەی مرۆڤێکی دۆزیوەتەوە؟!
کێ بۆتە سەربازی کەشتی (ئیمپریالیەتی ئەنتۆلۆژی)؟.
کەسێك چاوی بەڕەحمی ئافرەتێك کەوتوە مۆمیا کرابێ (..)
ئەم چرکەیە مەمکی کچکێك بە سێوەکەی دایکە حەواوە وێنابو.
لە گەڵ سێوەکەی نیوتن وێنەی کوڕێکی زمان یان دەدایەوە (..)
خاکی (زمان)ی هەڵفڕینی (رۆح) نەخشە دەکات.
لە نیشتمانێك ژێر پیاڵەی شەهوەتوداربنێشتی کچانەی تیا نییە.
ستونی جوگرافیای بەپەرۆ بوکێنییەکان تەنراوە.
لەم خاکەدا تۆوە شێرپەنجەییەکان لەزاو و زێی هێلکەوڵەدایە (..)
شیر لە کارێز هەڵدەقوڵێ و ئاو لەمەمك.
ئەم خاکە گێژەڵۆکەی زمانەوانی مەرگی فەزای فەلسەفەیە (...).
***
گومان بکە (..) لەو سێبەر و هێمایەی کەوێنە هەیەتی (..)
گومان لە تروسکەی   چاو و سکی هەتاو.
گومان لەوێنەی زیهنی فەلسەفەی مەرگ لەحەفەریاتیەکانی مەعریفە
ئێستا (مارکس) جنیالۆژیەتێکی هاڕمۆنی بۆ (ئیفلاتون) هەیە.
زەنون حەفریەیەکی وێنەیی بۆ حەوا دەکێشی.
کوا کاغەزە خوراوەکانی جنیالۆژیای زەمەن (..)
کوا ئەو بۆریانەی مەعریفە کەجرجی زەمەن تیایاندا رادەبورد؟!.
جرجێك نامەی دڕاوی سەرەتای هەڵگرتوە.
دەیەوێت لەئاهەنگی جرجەکانی سەرەتا بوك بگۆڕێتەوە.
ئێستا هاڕمۆنیەتی تایەفەی جرج یەك دەگرێتەوە (..).
سکی زەیستانی زەمەنێك پڕ دەکەن کەزنجیرەی نی یە..
بۆری ئارکیۆلۆژیای (بون نەبون) یان پچڕاندوە.
زەمەنە جیاوازەکان لەبەرداشی فەلسەفەی مەرگ هاڕان (..)

چی میحنەتێکە (بون) بەڕەگەزی (نەبون) ئاوێتەبو.
هێلکەی فەلسەفە لەگۆڕستانی شوشەیی ئاسماندا توایەوە.
لێرە لەم نیشتمانی مەرگە قەدەرێکە بەر لە (بون).
هیچ ژەهرێك نییە تامی مەرگ بدات (..)
مەرگ بێ جوگرافیاو وێنەو رەنگو شێوازو تامە.
زمان نیشتەجێبونی بونەوەرە بون نیشتەجێ بونی مەرگە (..)
لەم نیشتمانەدا (فیکر) تواناى نىیە پیاڵەیەك وێنا بكات.
چاو تواناى بینینی رستەیەكی نىیە (..)
دەمەوێت وشەیەك بڵێم (وشە)یەك كەرەنگی فەزای شارە.
ژەهری حەرف بۆ زەمەنی میتازەمەن نوقمم دەكات.
پرسیارێكە میتازمانی فەلسەفەی مەرگ بون نەبونی تیا حەشاردراوە.
چەند ساڵە زمانم بیرچۆتەوە (..)
لەگەڵ بەردێك بوینەتە پەیكەری حەفریاتەكانی مەعریفە.
كەتیرەی درەختی ئەم چاخە (بەرد)ی سیواخ كردو (..).
شارە مێروی زەمەن پاسەوانی دەكات!!
دەیان ساڵە تەنیا حەرفێكم بۆ ناگوترێت لەزەمەنی بەرد (..)
ئەم نیشتمانە دیالەكتیكی مەرگ و كەوتنە خوارەوەی (زمان)ە.
گۆڕستانی شوشەی بێشكەیەكی جنیالۆژیای میتازەمەنەوە
ئەم نیشتمانە دوا خەونی (هایدجەر)و یەكەم وێنەی (هێرقیلاتە).
بەردێكە هەزاران داڵ زمانیان لەفەزادا گرتوە.
بەردێكە بەفیكر وێنا ناكرێت (...)
جنیالۆژیای وێنەیەكی ذیهنیىیە لە (نەبون) وێنای هێلكەیەكە (...)
وێنای (من) و (تۆ) و (ئەوان) و (نیشتمان) (..)
ئەم بەردە (زمان)ی (نەبون)ی وێنابوی میتا زەمەنە (..)
ئەم نیشتمانە تەفكیكی هەناسەیەكە!!
ئەم نیشتمانە (..) ئەم (..) نیش (.) تما (..) نە (..)

(..) (...)

2000/5/21

---

1)(سدره) ئامارژەیه بەئایەتی 14ی سورة نجم (عند السدرة المنتهي).

(سیدرا) ئەفسانەیەکی سۆمەریەکانه (سدرا) مانای ژیانەوەیمرۆڤایەتیيه.

(سدرا) ناوی کچەکەمه.

2)نەفخ ئامارژەیه بەئایەتەکانی قورئان لەسەری بۆ نمونه (ونفخ في صور).

3) بۆ زۆربەی چەمکه فەلسەفیەکانی پێویسته هایدجەرو ئەوانیتری فەلسەفەی مەرگ وەك شتراوس و فۆکۆ بخوێندرێتەوه.

4-برایان کاك تاهیر عەبدولواحیدو ئەیوب خالید وەریانگێڕایه سەر زمانی عەرەبی برای شاعیرم (احمد الشیخ) بەسەریدا چوەوەو خۆی کۆمپیوتەری کردو پێشەکیەکیشی بۆ نوسیوه.له کتێبی سقوگ الکون بلاوبۆتەوه

# فەلسەفەی بەرد

**پێنجەم فاکسی ذیهنییە بۆ فەلسەفەی مەرگی ( مارتان هایدجەر )**

تەقینەوەی گریانێك لە بێدەنگی بەرد(..) زمانی (تۆ)یە (...).
با) یەك گڕی چرای سەرەتایی‌و کۆتایی(بون) دەلەرزێنێت.
گریانێك رەمزی تۆڕی زمانێکی گەردونی‌یە.
دار ئەلەتریکی زەمەن وشەو حەرف‌و(بون‌و ماهیەتی شێواندوە.
ئێستا زەمەن پریاسکەی بەردێکە ناسنامەی منە یان تۆ یا نەبونی ئەوە.
بێ زمانی من نیشانەی سەرەتایی‌و بەردە رەمزی هێشویەکە لە زەمەن.
ئاماژەی ئەو رستانەیە کە لە ئاسمانی (وشە)دا دەکەونە خوار.
زەمەنیش لە سیمۆتیکیای جەستەیەکدا سفر دەبێت.
کفنی فەلسەفەی مەرگ بە سیحری زمان دادەرێژێت.
گەردەلولێك لە فەزای ئەو وشانەوە دێت کە حەقیقەتیان بۆحەرف تیا نییە.
ئەو حەرفانە گێژ دەدات کە بون‌و تەقنییەو شێوەو حەقیقەتیان نییە.
ئەم چرکەیە زمان‌و شێوازو ڕوانینی بەردە بەرد فەلسەفەی بونە.
زمانی بون لە گڕی بەردەوە تەقنییەو سەرەتاو کۆتایی فیزیایی نوسی.
گێژاوێکی کۆمپیوتەری سەرەتا بە کۆتایو بەر لە بوندا دەخولێنێتەوە
زەمەنیش لە مێژوی جنیالۆجیادا ئاوێتەی فیزیایی دەبێت.
حەفەریاتەکانی مەعریفە پێکهاتەی گڕی بەردن بەردێك لە مەرعریفە.
لەسەر دوا ستونی فەزاوە جەستەی مندالأنی بون دەردەخەن.
جەستەیەك بە بالأمرۆڤ وبەشێوە روەك‌و بەخوێن بەردو بەحەقیقەت ئاژەڵ.
کۆرپەی بەحەقیقەت بەرد بە ماهیەت با بەتەقنیە تەکنەلۆژیابە شێوە مرۆڤ.

دوا زمان لە گڕەوە لە بێدەنگی  بەرد تەنیا وێنای گرێکە لە تەقینەوە.
زمان نیشتەجێ بونی بونەوەرە بون فەلسەفەی مەرگێکە لە بەرد.
رەمزەکانی فەزا لە ئارکیۆلۆژیای (نەبون)دا هەڵدەکۆڵێت.
ئێستا زەمەن لە سکی بەردێکدا گڕ دەگرێت رەمزی سەرەتاییە.
لە زماندا قفڵ دەبێت و لە بێدەنگیدا لە زمانی ئەو دا دەتەقێتەوە (...)

***

زەمەنی بەرد زمانی ئەو گەلآیانەیە کە مێژویان بۆبەرد لەبون گەڕاندەوە ..
وێنەکانی بە عەدەم بونی زەمەنیان بە مێژو خوم کرد.
ئاگر بارانی فۆتۆن‌و زانست‌و بون‌و فەلسەفە بە بەردەوە تەریب کرا.
گۆڕی شوشەی (رستە)و (وشە) لە نەبونی زەمەن پێك هات.
واتاو شێوازەکانی (حەرف) لە تەقنییەو ماهیەت‌و حەقیقەتدا کوژایەوە.
شریتی چوار هەزارەی (بون) لە چاویلکەی پێوەرێکدا سفر کرا.
نهێنی هێشوی هەزارەی حەوت لە بەردێکدا بە ئێستاوە گرێ درا.
وێنەی (من)و (چیچان)و (مسجد الاقصی) تێکەڵ بون بەبەرد.
شفرەی زامی (ئادۆنیس) لەسەر بەرد هەڵکەنرا.
بە نەوبوکەکانی نیل‌و ژنەکانی (نیتشە)و (تۆ)وە ئاوێتە بون.
جەستەی هێرقلیتوهێگەڵودارۆینودیکارت بون بەگەلآی درەختێك لەزەمەن.
هیجەڵ چوەچرکەی تەقینەوە هیرقلیت‌ودارۆین هەزارەی دوی نیاندەرتاڵ
دیکارت لەسەر بەردێك  وێنەی خۆی بە هەوری فیکری  پێوا.
رۆحی (پۆتین) بۆ چیچانی  نیاندەرتاڵ گەڕایەوە.
یەهود باراك لە ژێر بەردی  پەرەسێلکەی مەکە[1]  پاڵ کەوتبو.
ماجەلان‌وئەمریکۆونوح‌وکۆلۆمبس لە کەرەجاڵ مارکس‌وئەنجلسیان بینی.
بەکەشتی ژێر ئاوی (هێتلەر ) بۆ چاخی بەرد خولانەوە (...)
گەردون بو بە باڵە فڕەی مریشکێك.
لە فەزاوە مەیمونولەماهییەتدا مرۆڤوبەحەقیقەت تەکنەلۆژیاوبەتەقنییە تۆ
بە چوار رەنگە فیزیاییەکەوە تێکەڵاوی  گرێك دەبو لە (بەرد) (...)

***

سفربونی زەمەن لەبەردی کۆتاییەوە گەڕایەوەچەقی ناوەراست وئێستا ...
مارکس پەیژەی جەدەلییەتی هەڵناو وێنای ئیمپریۆ کریتیچیزم بو.
مانگ بە رۆژەوە خەوی بینی منداڵێك لە فەزادا کەوتە خوار.
لە مەریخەوە بە مرۆڤ دەردەکەوت و لە زەویەوە مەیمون لە هەواوە بەرد
بەردو مرۆڤ و مەیمون تێکەڵاوی رەنگەکانی زانستی فیزیایی ببون.
ئەنشتاین لە زوحەیلەوە کەوتە خوار لە هەسارەی بەردا گیرسایەوە.
زەمەن لە میتا زەمەن و میتا کۆتاییدا مۆمیای بێدەنگی بو (...)

***

ئێستا زەمەن کلافەی زمانەوانی فەلسەفەی مەرگی ئێستایە بە سەرەتا..
هێشوی تابوتێکی سپی رەمزی بونی خۆرئاوایە بۆ خۆرهەلات.
نیتچەوئەنیشتاین ومارکسوفۆکۆلەفۆتەی ئیمپریۆکریتیچیزمدا پێچرانەوە
ئیمپریالییەتی فیکر ئیمپریالییەتی ئەنتۆلۆژی هەزارەی چوار نیشان دەدا.
هیدجەربەکفنی فیکرەوە سیبیرنیتیقا دەگرێتە تۆری فەلسەفەوگرێی فیزیا.
چرکەیەك بایەك فۆتۆی زەمەن دەکات رەنگی مێژوی کوژاندەوە
زەمەنی بون لە زەمەنی تەقینەوەی (بەرد)ا نیشتەجێ بو
بون لە نەبون دا دەتوێتەوەو (نەبون) لە (بون)و (زەمەن) دا
ئێستا زمان رەمزی ئەوە لە فەلسەفەی بەردا جێگیر بوە
کاتژمێری زەمەن لە بەردەوە بۆ بەرد دەسورێتەوە
فەزا جەستەیەکە لە بێ زمانی بون رەنگی نەبون یێکی دوای زەمەنە
سێ گۆشە بەردێك میتا نەبونی ئێستا وسەرەتاوکۆتایی رەمزی بون ە
بە تۆزی زەمەن سیواخ بوە و بە شالاوی مێژو سڕایەوە
مۆری پۆتین و باراك و بۆش و کلنتۆنی سەردەمی لوطی[3] پێوەیە
لە زەمەنی سفردا مانگە دەست کردەکان دەخولێننەوە
هەر بەردێك وێنەی چاوی نێرینەیەکە کە سیمای ژنێکی نیتشەی تێدایە
ئەو چاوانەی تەمی گومانی فەلسەفەی مەرگیان پۆشیوە
وێنەی (هێجەڵ و ئیفلاتون و فیورباخ و نیوتن و دیکارت) دەکێشنەوە

بەردێك کە فیرعەون شتیو سیزیف فەلسەفەی لەسەر مۆر کرد
مارکس جەدەلیەتی (هێگەڵ)ی لەسەر پێوا
ئەنیشتاین بۆ فەزا کشاندیو بەبالای (ئەنجلس)دا گرتی
ئێستا لە تۆری زەمەندا گرێکانی ونبون بەگڕ دەکاتەوە
بە فانۆسی سیحریەوە بۆتەنەو بوکی میتا زەمەنو لە میتا بوندا توایەوە
رەمزی کچێکی کڕ کەوتوی هەزارەی دوەمی سفرە لە هەزارەی حەوت
رەنگی نیاندەرتاڵو شەهوەتی هەزارەی سێیەمی پێیە لە ئێستادا
گۆشتی لە خۆڵەو خوێنی لە ئاو و شەهوەتو گڕە.
چاوی لە وێنەکانی سوقراتو فانۆسی سێزیفو برژنگەکانی ئەسکەندەرە
لە ساتێکدا سێوی حەوا دەخواو ساتێك هەوای تەکنەلۆژیا
بەو پیاوانەوە شەیتانی بوە کە لە چای ئافرەتەکانی نیتشەدا هەیە
شەهوەتی لە ژەهری (سوقرات) و بە قوڕاوی لافاوی (نوح) سیواغ بوە
سمتی نێرینەیەوسنگ نەوبوکێکی نیلوقژی تەکنەلۆژیای چاخی سفر
لەگەڵ تەقینەوەی فۆتۆناتدا بە بەردی زەمەنەوە گڕ دەگرێت
بەردەکانی زەمەن بە(بون)ەوە دەتەقیننەوە (...)

***

زەمەن چی بوعدێکی فیزیکی لەسەر بەرد و هەڵکەند بۆ تۆڕەکانی بون ..؟!
لە گێژەنگی رەشەبای بەر لە بونو گەلاکانی دوای زەمەنی بون
وێنەکانی بون بەسەگ تۆمار بون ولەسەر بەردی دوای گڕی مرۆڤ
ئێسكو پروسکی منداڵێك لە دوای زەمەنەوە نەخش بو
ریخۆڵەی لەملی کلنبۆشوسکی لەباوەشی باراكوسەری لەقوڕگی پۆتیندا
بە تەنافە بەردیەکانی بونەوە یاری زەمەنی دەکرد
ئەو بەردە بە مۆر هەڵکەنراوانەی زەمەنی لوط شارایەکە لە فەزای ئێستا
لە ئەفسانەی سفر بونی زەمەندا شاردرانەوە لە مێژودا
ساتێك پەرەسێلکەبەردهەڵگرەکانی مەکە دێنەوە ئێستاوسەرەتا دەگرنەوە
بەردە ناونراوەکانیش مۆری هەزارەی دوەمیان هەڵگرتوە
مێژو زەمەن چاوشارکێ بە بەردی مۆر کراوەوە دەکەن

وێنەکانی بون بە درەختی نەبونەوە ئیمپریالیەتی فیکریان پێك هێناوە
شەپۆلەکانی ئاسمان سەوزن وێنەی خوا دەدەنەوە
وێنەیەك لە من دەوە بۆ تۆوسوقرات وهێجەلۆ حەوا دەگەڕێتەوە
هیچ چاوێك نی یە لە (بون)دا بەو وێنەیەوە نەپۆشرابێت
من لە کفنی گومانەکانی تۆدا درەختە فەلسەفیەکان رادەوەشێنم
هەمو شەپۆلەکانی فیزیایی بون بە وێنەی خواو جیهان رەنگی ئەوە
زەمەنی بەرد بونی لە مێژودا تەقاندەوە بو بە بونی بەرد
چرکەیەکە زمان لەبێ زمانی بون دا لە حەقیقەتی تەقنییەدا دەتەقێتەوە
***
زەمەنی بەرد رەمزی بونە لە دوای کوشتنی زەمەن لە مێژوی بون ...
ئێستا نەفخ فەزای بونی گڕداوەو تەنیا بەرد پاشماوەی تۆیە
بەردیش لول بو بە زەویەوە جێ گۆرکێی کردو لە بۆشایدا سفر بو
ئێستا ئاسمان وەك سەرەتا سپی تەنیا سپی رەمزی بونی تۆ یە
زمانێك رەمزی منو تۆوبون)ی لێ نوسراوە تەنیا بەردە
نیتشە بە دوای زەرا دەشت دا گەڕاو ئەویش بۆ سەرەتا گەڕایەوە
مارکس هیگەلو زەنونی لێ ون کراو ئەوانیش زەمەنو مێژو
لینین بە پەیژەی ئیمپریۆ کرێتێچیزمدا هەڵگەرا بۆ فەزای وشە
هایدجەر ئیمپریالیەتی فیکری هەڵدا بۆ هەسارەکانی بۆشایی
فۆکۆ بە تونێلەکانی مەعریفەدا ئارکیۆلۆژیاو جنیالۆژیای پشکنییەوە
فۆتۆی زەمەنێك لە بەرد ئێستای بە بەرد گۆڕییەوە
هۆڵدرلین بە سەگێکەوە (هێر قیلات)ی بۆ (هایدجەر) دۆزیەوە
سەگێك گۆڕە شوشەییەکانی فەلسەفەی دەدی
جامە شەهوەتە قەپاتەکانی دارستانی جیهانی هەڵدەگرتەوە
لە چاویلکەی تەقنییەکانی فیزیاوە بە کچێکی ئێستاوە جوت بو
لە زەمەنی (بەرد) لە تەقینەوەی (بون)دا زاو وزێیان کرد
زەمەنی بەرد زمانی شفرەکانی ئێستایان پێك هێنا
ئێستا زەمەنی بەرد ناونانی منە بۆ تۆیە تۆیەبۆ تۆرێکی نادیارلە فیکر ...

چرای بون ئەوپەپولانەیان گرتوە کەپۆپەشمینی فەلسەفەی مەرگیان پێیە
ئیمپریالیەتی ئەنتۆلۆژی‌و ئیمپریالیەتی فیکر بە گۆڕی شوشەیی پێورا
من‌و تۆ و ئەوان و ئێمە وئەوانی دواتر چوینە ئاگری فیکر
ڕەنگی سەوزو شینی ئاسمان گڕی فەلسەفەیەك بو لە مەرگ گڕێك لە بەرد
ڕەمزەکانی (خوا) بە شینایی ئاسمانەوە دیارن
هۆڵدر لین چاوەڕوانی خواوەند دەکات
نیتشە لە پانۆرامای شەتڵە فەلسەفیەکانی (نەبون) دا هەڵکشا
قولەکانی زەرادەشتی گڕدایەوە بە جەستەی من و تۆی هەزارەی چوار
زەنگێك لە سامالّی فەزاوە لانکەی (بون) رادەژەنێت
کە تەنیا ڕەمزەکانی (من)ن شفرەکانی (تۆ)یت هێماکانی (ئەوە)
لە خاکێکەوە سەیرت دەکەم ئەوان ونن تۆ نادیار
ئەم خاکە نە درەختێکی تیایە ڕەحمی مێینە بگرێت؟!
نە سنەو بەرێکی هەیە دڵۆپەی شەهوەت بپرژێنێت؟!
لێرە نە دایکە وباوکەیەك هەیە بە دیارهێلکەی بون نەبونەوە کڕبکەوێت
نە شەوقی مانگێك وێنەی تۆلە چاومدا پێچەوانەوە دەکاتەوە
زەویش بەردێکە لە مێینەیەکی ئاژەڵی کە تەنیا پرچی لە مرۆڤە
لە دوا ساتی زمان دا بە گڕی بەرد لە زەمەنی سفردا دەتەقێتەوە
ئێستا گڕی بەرد ڕەمزی زەمەنێکە هێمای من و تۆو ئەوان‌و نیشتمانە
بەرد زمانی کۆتایی بونە ئاماژەی گریانی ساوایەکە لە (ئێستا)دا
دوا وشە و حەرف‌وشێوازو ڕەمزوهێمایەکی بون و نەبونە
ئێستا زەمەن بە ( بەرد) وێنا بوە (بەرد) زمانە
بەرد گڕی ئاماژەیەکە لە گریانی بێدەنگی (تۆ) بەسەر زەمەندا دەتەقێتەوە
(...) ( بەرد زمان)ە (...)
(...) (بەرد) (...)
(...)

1-ئاماژەیە بە ئایەتی ( بحجارة من سجیل)

2–ئیمپریۆ کریتیچیزم: مانای ماددەو رەخنەی لێکۆڵینەوە.

3–ئاماژەیە بە ئایەتی (بحجارة مسومة)

4 ئاماژەیە بە ئایەتی (یوم نطوی السماء کطی السجل للکتب کما بدانا اول خلق نعیده)

5 شاعیری نوێخوازی عەرەب (احمد الشیخ) مراجعەی کردەوە و خۆیشی کۆمپیوتەری کرد بڕیارە لە م ژمارەیەی گۆڤاری (اسفار) دا بڵاو بێتەوە.

کاك محی الدین محمود وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی

لە کتێبی سقوگ الکون دا بڵاو بۆتەوە

# كەوتنە خوارەوەی گەردون

فاكسی شەشەمی ذیهنییە بۆ فەلسـەفەی مـەرگی

فەیلەسوفی زەمەن ( مارتان هایدجەر)

*************

وەرە یاری گەلاڕێزانی (من)ە بۆ (تۆ) (..)

لەگەردەلولی زەمەنی گومانی (نەبون) دا پۆشراوە.

من وتۆدا زاینی سەدەی كەوتنە خوارەوەی گومان وزمان ین.

ئێمە كەفی تواوەی رۆحێكین لەئەتۆمو فۆتۆنات.

گومانمان لەدرەختی زمان" لەبێ شوێنەواری بوندا سەوز بو.

وێنەی كەوتنە خوارەوەی (بون)ە لەزەمەنی (نەبون).

ئێستا ساتی گریەی ساوایەكە رەمزی زەمەنێكی تێكەلاوە.

بەدوا كچی هەزارەی سفرەوە وێنای (تۆ)یە.

لەچركەی كەوتنە خوارەوەدا وێنای گڕوگالێك دەبن لە (نەبون).

لەگەڵ زەنگی تەكنەلۆژیای ساتەوەختدا (هایدجەر) رادەچەنێن.

ئەم چركەیە هەمو رەگەزێك وێنەی شقارتەیەكە بەر لە (بون).

هەموێنە ورەنگو روخسارو هێمایەكی بون لە نەبوندا شۆراوەتەوە.

تەنیا جەستەكرمەڕێزەكان بەگلۆپی تەكنەلۆژیاوە لەمێژودا دەردەكەون.

ئەم چركەیە هێمای كەوتنەخوارەوەی من و تۆو ئەو و ئەوان و زەمەنە(..).

**

لە كەوتنە خوارەوەی عەشقەوە هاتوم (..)

فۆتۆناتی گەردون بریسكەیان دەدا.

تۆ بچۆ بۆ بەردەبازی کەوتنە خوارەوەی رۆحی (نەبون).
منیش ئاوێنەکانی منداڵی کۆدەکەمەوە.
تۆم لـیٚبوە بەئاگرێك لە (نەبون).
ئەویش وێنەی دایناسۆرێکی دوای (زەمەن)ە زەمەنێك لەبەرد.
ئێستا (ئەوان) چی سەدەیەکی گومانن کام (دازاینەن) لە (بون)؟.
گرێکن رۆشنایی چاو بەدی ناکات وێنەی (تۆ)یە یان (ئەو)؟
لە چاوی  (سدرا) وە دەبنە دڵۆپە شیرێك لە (گومان).
لە رەنگی گەڵاکانیەوە رەمزو ئاماژەی خوا دیاری دەدا(..)
با ی (نەبون)ی زەمەنێك لەبەرد لەئەفسانەیەوە هات.
بە گێژەڵوکەی سۆمەریەکانەوە ژیانەوە بە نەبون مۆمیا دەبێت.
چییە؟ ئەم سەدەی گومانە ئەم دازاینەی لەرۆح دا سەوز بوە؟
لێرە زەمەنێك هەیە پاشماوەی بەردەو سەرەتای (نەبون)ە.
هەمو ئاوێنەکانی (بون قڵپ دەکاتەوە).
بەسەر زەمەنی نەبوندا تێك دەشکێنرێت (..).
زەمەن بەشارای ئاوێنەی منداڵی سەرەتاو کۆتایی پێك هاتوە ...
لاکان هەمو ئاوێنەیەکی لەچارەنوسی منداڵێك هەڵکەند.
لە هێزی نیسبی و فانۆسی سیحری بەست.
تەنیا منداڵی من و دانت و نۆئێل وئیسماعیلی بزر کردوە.
ئێستا منداڵێکم بێ ئاوێنە، بێ جوگرافیاو (زەمەن).
بەحەوت چراوە بۆ گیای نەمری زەمەنی (نەبون) دەگەڕێم (...)
لە گۆڕی ئیسماعیلدا بزر بوە.
گەردەلولی زەمەن ئاوێنەکانی لەبۆری مەعریفەدا شاردەوە.
پاسارگەی (بون) بەپرسیاری (زەمەن) پڕ بۆتەوە.
من منداڵی زەمەنێکی سفرم لەنیشتمانێکی نەبونەوە هاتوم؟
یان تۆوی کەسێکم بەر لە (بون) لەهێڵەکانی ئەفسانە.
لە بونەوە بەسەر نەبونی زەمەندا کەوتومەتە خوار؟

چییە چەرخی گومانێکە لە تۆ.. لەو.. لە تەکنەلۆژیاوبون و حەقیقەت.
ڕەمزی کەوتنە خوارەوەی (نەبون) ی (بون)م هەڵگرت.
لە هیچ زەمەنێکدا ئاوێنە وێنام ناکات.
زەمەن بونم ناخوێنێتەوە لەجوگرافیای بەرد.
لە هێلکەی مریشکە کرەی (بون) دەچم.
من (لەوم) یان (ئەو) لە (من)ە.
وەرە با بەدوای ڕۆحی باوکمانەوە بۆ نەبون بچین (..)

**

وەرە با یاری لەساتی پێك هاتەیی مێژو زەمەن و بون بکەین (..)
باوکی سەرەتایی دایکی کۆتایی مارە دەکات.
چرکەیەکە خۆر خەو بە (تۆ) وە دەبینی.
تۆش بەسەر دڕکەزیەکانی زەمەندا دەڕۆیت.
وەرە باساتێك خەت خەتێن لەسەر مێژو بکەین.
تۆ قیڕاتی کۆتایی بگرە.
منیش ماڵێکی بەر لەبون (..)

**

ئێستا کفنی فەلسەفەی مەرگم دڕاندوە (..)
دەچم زەنگ لە کوختەکەی (هایدجەر) دەدەم.
ئێستا ساتی ڕاچەنینی هایدجەرە بۆئالآی ئیمپریالیەتی فیکرلە دوای بون.
منیش بەدوای ڕۆحی باوك و دایکمدا دەگەڕێم.
مەمکی دایکم لەسەر کفنەکەیەوە هەڵدەمژم.
بۆن بەهەناسە گەرمەکانی ساوایی‌یەوە دەکەم.
باوکمەوە وێنەی خوا دەبینمەوە (بۆنێك).
لە سەوزایی ئاسمانەوە بەوێنەی (سیدرە) وە تێکەلآو دەبن.
بەگەلآی سدرە خۆم دەشۆم هەتا بمرمو گیای نەمری ببینمەوە.
ئێستا کۆلارەی بیر تێکەلآوی دارستانی خەیاڵ بوە لەئەفسانەی بەرد.

گەردون بەباڵی مەلێکەوە تەنیا گۆڕێکە (تەنیا).
تونێلەکانی مێژو بەرۆحی تواوە پڕ بونەتەوە.
زەمەن کلافەیەکی بۆ سەرەتاو کۆتایی نی‌یە.
بەمژینی مەمکی دایکمەوە بۆ چرکەیەك لەبێ زەمەنی زمان دەگەڕێم.
تۆش مەمکی دایکت بمژە هەتا عاشقەکانی بون نەبون بگۆڕدرێنەوە.
وەرە با ڕوخسارمان لەزەماوەندی زەمەندا بگۆڕدرێت.
هەتا لەم رەشبەڵەکی مێژوەدا ببینە میتا مرۆڤی میتازەمەن (...)
**
ئێستا ئاگر بارانی زەمەنو چرکەی میتارۆحە (..)
بە شیو و دۆڵی میتازەمەندا (بون) (نەبون) و رۆح دەبڕن.
ئێستا خۆر 93 پلە دورە لە رۆح و 89 لە جەستە (...).
تیۆری نیسبی بەکلافەی میتامێژو رایەڵ بوە.
گەرمێك لەمارکس و ساردێك لە فێورباخ.
وزەیەك لەئیفلاتونو هەناسەیەك لە تۆ و ئەو و ئەوان.
لایتی فەلسەفەی مەرگ لەسەر هێرقیلات هەڵدەگیرسێت (..)
زەمەن قفڵی دولایی میتانەبونی لێدراوە.
سەگەکەی هۆڵدرلین بەسەر جەستەکانی مێژو دابۆن دەکات.
بۆنێك لە فەلسەفە (...) بۆ هێرقلیت و لە مەرگدا (تۆ).
ژەهرەکەی سوقرات لەسەر مێزی هەزارەی هەشتەم دادەنێت.
تۆ و هێگەڵ و فیختە و نیتشە بیخۆنەوە.
چراکانی (دانتی) لەباخچەیەك داگرڕ دەگرن.
زەمەن سفر دەبێتو (بون نەبون) تێکەڵاوی بێرەنگی دەبنەوە.
گیای نەمری نیشانی (نۆئیل) دەدەن.
وەرە بەرگی قەصدییەی (هۆسرل) بپۆشە.
بەچرنوك جەستەی هێگەڵ ئەنجن ئەنجن بکە.
قەصدیە بپۆشەو لای لایە بۆ هایدجەری بەر لە بون بکە.

دەستی دارۆین بگرە وببە بەمەیمونو گیای نەمری بخۆ.
وەرە باپێکەوە ئیسماعیلی کوژراو بنێژین.
هەتا باوکمان ئێمەش بکوژێتەوە.
**

من و تۆ بەتونێلەکانی زەمەندا بۆ سەرەتا دەگەڕێینەوە (..)
لە سکی ئەم دایکەوە بۆ ئەوی تر.
لە پشتی ئەم باوکەوە بۆ یەکەم.
وەرە باخەت خەتێن لەسەر زەمەنی (بون) بکەین.
بزانە من کوڕی فیرعەونم یان (تۆ)؟
ئەو نەوەی موسایە یان (من).
سەیر چۆن مەمکی دایکم بۆ (بون)ێك لە (نەبون) دەمژمەوە.
وەرە بە پەیژەی زەمەندا شۆڕ ببینەوە.
بزانین کێ دەچێتەوە پشتی هابیل.
ئەوسا قفڵی دولایی زەمەن مۆر دەکات.
پێك هاتەی کەفی رۆحێکی بەر لە (بون)ی (زمان) دێتو
لەو دیو پەردە تەڵخەکانی هەزارەی سێیەم دا وێنەدەگرین.
کۆرپەمان لە تاریکخانەی (نەبون)دا دەناسینەوە.
لە منەوە بۆ تۆ و سیدراو هابیل (..) و ئەو(..).
**

ئێستا زەمەنی (نۆئیل)ی هەزارەی دوەمی رۆحە (..)
گیای نەمریو ژەهری فەلسەفە تێکەل کەأ.
منیش چەقۆی ئیبراهیمو هابیل لەدڵ دەدەم.
بە پلیکانەی (بون نەبون)دا دەچینە خوار.
هەتا پشت بەپشتی مێژو لەناوەندی زەمەنەوە یەکتر دەکوژێت.
کوانی تۆڕی گرێی ئۆدیب؟
من دەمەوێت باوکی مردو بمکوژێتو.

ئەویش باوکی سەری ببڕێت..
کوا فرۆیدی هەزارەی دو گرێی ئۆدیبی ئەم زەمەنە بکاتەوە (...)
پلیکانەی کوشتار هەتا پشتی باوکە ئادەم گەڕایەوە.
کێ ئەو بکوژێت؟!
وەرە قولاَیی میتازەمەنی تۆ و ئەوان و ئەو و من و ئەوانی دواترە (...)
**
ئێستا گەردون وێنەی کەوتنەخوارەوە دەکێشێ (..)
لە تاریکخانەی (بون)دا وێنەمان نی یە.
زەمەن تەختە رەشی (بون)ی سوتاند.
کلاَفەی جەدەلییەت بۆ (سوقرات) چو.
لە نیتشەوە بۆ (تۆ) و (ئەو) و (زەمەن) (...).
لە ئیفلاتونەوە بۆ ئالَتۆسێر.
وەرە پیالَەیەك ژەهری فەلسەفە و گەلاَی سیدرە تێکەلاَو کە
باسوقراتی بەر لەزاین بژی و
تۆی چاخی 21 بمریت (...)
وەرە بابوکە بەبارانەی زەمەن بکەین.
خەت خەتێن لە سەر کۆجیتۆی دیکارتی نەزەمەن بکەین (..)
**
وەرە ڤیستیڤالَی زەمەن لەکەوتنەخوارەوەی گەردوندایە (...)
من دەچمەوە سکی دایکم.
تۆش بڕۆرە گۆڕی هێگەلَی هەزارەی دە.
خۆت بەگەلاَی سیدرە بشۆ (...)
منیش دەچمە قەلاَدۆشکانی یەکەم دایك.
مەمکی دایکم بۆ دوا دایە دەمژمەوە (...)
تۆش دەستی دوا باوك بگرە.
لە کۆلارەی یەکەمی مێژو دا مۆمیا دەبم.

هەتا جارێکی تر دایکم سك بکاتەوە و

بە وێنەیەکی ترەوە لە زەمەنی سفردا لە دایك ببمەوە (...)

***

2001/7/11 سلێمانی

ئیمپریالیيەتی فیکر ناونانی منە بۆ هایدجەر ئەولای وایە کەسیبرنتیقا جێگەی فەلسەفە دەگرێتەوە. واتە ( علم التوجیه ).

کاك هوچشیار شێخ أنور وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لە کتێبی سقوگ اکون دا بڵاوبۆتەوە؟

# درەختی زمان

ئەم زەوییە ( ... ) هێمای ون بونی وێنەیە !!
تۆڕی گومانی بێ دایە لۆژ ( ... )
درەختی زمانمان گەڵای وشەی نەگرتوە
تۆو چەنی ڕۆح,
لە جوگرافیای جەستەدا سەوز نەبو
( بون ) بەقەدی ( شوکران )ەوە موتوربە بو
ڕەنگی هەڵماتێکی هەڵگرت
هێمای بی زمانی ئاو.
توانەوەی ئەڤین و روخسار
جوگرافیای نیشتمانێکە,
بێ ئاسمان و زەوی و گەردون
ئەم زەوییە ( ... ) ( ... )

***

ئەم زەوییە شوێنەواری ئەفسانەیە ( ... )
سەرهەڵدانی هێلکەوڵەی چاخێکە
سەد بلیار بەر لە ( بون ) و دوای ( نەبون )ە
تەونچنی جەستەیەکی مۆمیای ڕزیو
هێشوی وشکی ڕۆح,
لە قۆزاخەی ئەتۆمدا چرۆ دەکات (...)

***

ئەم زەوییە چی دورگەیەکی گرتوە ( ... )؟!
لە تونێلی گەردونەوە هاوارێك دێت !!
کەنیسەی خاچ بەبای ( جوبریل ) لەرزینەوە!!
چرای سەربازی ئەشکەوتی هەور
ئاوێنەی قەزەمێکی ( نێرمێیە )
ئەم زەوییە ( ... ) بێ زمانە ( ... )
***
ئەم زەوییە چی جوگرافیایەکی بونە ( ... )؟
هایدرۆجینی سەراب مێژوی هەڵخست
بلیار بلیار درەختی مریەم سەوز بو
نیلی شیمیاوی ئەم ساتەی ڕژایە سەر (...)
***
ئەم زەوییە چی خاڵێکی مێژو دەگرێت..
چرکەی دوا مرۆڤ کاتژمێریەتی
هاوتەریبی تابوتی خۆری ئادەمە
میلی چرکەی مێژویەکی سفری کۆیە
دۆژە سارای سەراب گرتی
ئەم زەوییە ( ... ) ئەم گومانە ( ... )
***
ئەم زەوییە چی ناونیشانێکی هەیە ؟! (...)
نەزەمەنی ئاوێنەی ( لاکان ) و ( هۆسرڵ )
نەتیوری مادی و نیسبی
ڕەنگیان هەڵگرت؟
نە فۆتۆن و گیای نەمری؟

فليمی نەوبوكی نيل و
زنجيرەی نەخشەكانی مێژوی فۆكۆ
لە ئەشكەوتی ژێر زەویا كوژانەوە ...
چەند هاوارێك بونی لەرزاند ...
ئەم زەوييە ( ... ) بێ زمانە ( ... )

**

ئەم زەوييە ناونيشانی مادی نييە ( ... )
لەئاوێنە و كاتژمێر و بيرەوەريتان بڕوانن
فەرشی زەمەن بو بە سوتو..
هەمو (بون) يێك تەشكيلی جوگرافيای خوێنە ( .. )

***

ئەم زەوييە سێوی درەختێكی هەورە ( ... )
كفن و لانكەی نيوتنی هەڵگرتوە
بە دو دەرياوە, وێنا بوە ( 1 )
( نێرمێ ) لە سوێراوی نامۆييدا دەمرن
ئەم زەوييە ( ... ) ئەم ( ... )

***

ئەم زەوييە سڕينەوەی ( نە بون ) لە ( بون )
( ... ) ئاسمان تەونچنی شيتەڵ كرا
بێ هێزی نيسبی ڕايەڵ بو
بای ئەزەلی هەمو ( بون )ی پێچايەوە
سەرەتايە ( .. ) كۆتاييە ( ... )سەرەتايە
( ... ) ك .. س .. ( ... )

***

ئەم زەوییە سەرابێکی ئەفسوناوی ( ... )
گوڵە جۆی گێژەنگی سەرەتایە
تۆزی نیاندەرتاڵ خۆراکیەتی
تەنیا ژەمە شیری ساوایەکی تیایە
ئەم زەوییە ( ... ) ئەم ( ... )
***
ئەم زەوییە چراخانی ئەستێرە ڕەشەیە ( ... )
هێلکەوڵەی ئەفسانەی بەرد
وێنەی چاخی سەدوپەنجای تیادا دیارە
***
ئەو زەوییە گومانێکی یاخی لە عەقڵ ( ... )
خۆر و وشەو نیگای نییە ..
ئەڤین لە زەریای نە ( بون )دایە
دایەلۆژ لە فۆتۆناتدا خەفە بوە
چەند هاوارێك چوە گەردونی بێ دەنگی
بێدەنگییەك کوژایەوە..
بلیارد ڕۆح کەوتنە خوارەوە
گەردون بە بێشکەی ساواوە لەرزی!!
هێلکەیەکی ئاوێتەیی ..
ئەم زەوییە ( ... ) ئەم زەوییە ( ... )
( ... ) و ( ... ) و ( ... )

1997/4/19

ئاماژەیە بەئایەتی (19و 20) لەسورەتی (الرحمن)دا
لەگۆڤاری گەلاوێژی ژمارەی 2/ 1997دا بلاّوبۆتەوە

# گەردونی عەشق

پەنجەرەکان ناکرێنەوە ( ... )
ئەم زەوییە بە بای سەڕ سەڕ وشك بوە
درەختی عەشق سەوز ناکات!
زەمەنێکی بێ بەهایە
پەنجەرەی ( بون ) لەسەر ( نەبون ) داخراوە
ئێستا ساتی هەڵوەرینی شوشەی ڕۆحە!!
دۆزەخی عەشق چی نیشتمانێکی هەیە؟!
گەردون میلی کاتژمێری عاشقێکە
لە مێشکی ئەنیشتایندا چرکە دەکات
ئەفسونی ئەم عەشقە شێر پەنجەیە بۆ ( بون )
وێنەی چەقۆی خۆکوشتنی منداڵییە
پەنجەرەکان داخراون (...)

***

پەنجەرەکان ناکرێنەوە (...)
ئاپارتمانی ڕۆح ڕوخا
نیگا و ڕوخسار کوژایەوە

گەردونی عەشق بە خۆکوشتن قفڵ کرا
ئاوێنەی نیگای منداڵی بەتابوتێك وێنابوە
جەستەی کرمە ڕێزی زەمەنێکە
پلیکانەی ( بون, نەبون ) یان پێك هێناوە
چی سیحرێکە گەردەلولی عەشق؟!
گەڵای زەمەن چاو و کەللە و پەراسوە
عەشقێك بەری خۆرئاوای گرتوە
تابوتێك لە ڕۆژهەڵات وێنا دەکات
پەنجەرەکان داخراون ( ... )

***

پەنجەرەکان ناکرێنەوە ( ... )
( بون ) و ( جوگرافیا )ی نیشتمان هەرەسی برد
زەوییەکە بونی نییە ..
( بون ) وێنە و ناسنامەی نییە
شێرە بەفرینە زمانی جەستەی ساتەوەختە
چرکەی کەوتنە خوارەوەی نیگایە
چی ساتێکە ڕوانین بەخوێن سیواخ بوە؟!
گەردون رەنگی شەهیدێکی دوای نەبون ی هەڵگرتوە (...)!!
پەنجەرەکان داخراون (...)

***

پەنجەرەکان ناکرێنەوە (...)
زەنگی ئەزەل هێڵی ( نەبون )ی گرتەوە
شەوارەی ئەتۆم و فۆتۆن و ئەلەتریکە
زەوی رەنگی قلْپ بونەوەی ( نەبون )ە

کاروانی سەرەتا ڕابورد

بوکی کۆتایی سەربڕا

ئێستە دڵم ماجەلانی زەریای عەشقە، جوگرافیای زەوی تێك دەدات

عەشقم داگیرکەری خاکێکە

درەختی عەشقی تیا بڕوێت

ئەفسانەیە دۆژە سارای ئەم عەشقە

چی گەردونێکی ڕوانین داگیر دەکات؟!

چی پەردەیەك لە دوای بونیەوە ڕەنگ بوە؟!

درەختی ئەم عیشقەم کۆچەرییە؟!

لەچی خاکێکدا بینێژم

پەنجەرەکان داخراون ( ... )

***

پەنجەرەکان ناکرێنەوە (...)

دڵم بە دڵی نایلۆنی (پەلسن)ەوە جوت بو

تۆفانی عەشق شێرپەنجەیە

ناسنامەی نەشتەری خۆ کوشتنە

پەنجەرەکان داخراون (...)

**

ئەنجەرەکان ناکرێنەوە (...)

دارستانی عەشقی هەتایی سوتێنرا

کوا گۆڕەپانی منداڵی؟!!

منداڵدانی دایکم لە چی زەوییەکدا سوتا؟

ئەو پەنجەرانەی ڕۆژانە دەکرانەوە

بۆچی گەردونێك کۆچیان کرد؟

ئێستە دڵم قولاپێکە
ڕوخساری ( نەبون ) و ( بون ) دەگرێت
پریاسکەیەکی سیحرییە
نەشتەری ئەم عەشقەم هەڵی دەدڕێت
ئای ئەفسانەیە کۆتایی نەهاتنی عەشق
لە مەرگەوە سەفەر بۆ گەردونی مەرگ دەکات
نیشتمانێك نییە ببێتە گۆڕستانی جەستەی
پەنجەرەکان داخراون (...)

***

پەنجەرەکان ناکرێنەوە (...)
چی ساتێکە ئەم خەردەلی عەشقە
لەفانۆسی سیحری ئەدیسۆنەوە گڕ دەگرێ
ئاوێنەی شکاوی منداڵی سەرەتا کۆدەکاتەوە
ئێستا دڵم گۆڕستانێکی ئەبەدییە
ساتە وەختی هەڵوەرینی شوشەی عەشقە
پەنجەرەکان داخراون (...)

***

پەنجەرەکان ناکرێنەوە ( ......... )
ئای تاریکستانی عەشق
گەردەلولی نیشتمانێکی بێ زەمەنە
عەشق بە فۆتۆنەوە گڕ دەگرێت!!
ئێستا دڵم زەوییەکی بێ جوگرافیایە
درەختی عەشقیش کۆچ دەکات
هەمو ئەستێرەی بۆشایی توایەوە

زەویەك نییە ڕەگی ئەم عیشقە هەڵگرێت؟!
پەنجەرەكان ناكرێنەوە (...)
ناكرێنەوە (...) ناكرێنەوە (...)
(...)

1998/2/1

لەگۆڤاری رامان ژمارە 1998/30 دا بڵاوبۆتەوە

# چیای ئاوێنە

نیشتمانی من (....)حەوت چرای دانتی
ئاپارتمانی هەزاران جەستەی مۆمیای کرماوی
نەخشەو سنوری تەلبەندی چاو وگۆێچکەو پەراسو،
قبیلە نومای گەردەلولی تونێلی (بـــا)
لەم خاکەدا ژیان کەفی هەڵماتە شوشەی تێزابە
تەمەن پوش پەڕی خەزانی پایز
سروشت سێبەری تەمی ئاوا بون و کوێر کردنەوەی
چەرخی کلتور وکات
جستەی تۆو چەنی ئاوێنە نیگای هەناسە رەنگی
ئاورینگی مەمکی پڕاوی زەوییە
ڕەنگی قڵپ بونەوەی وێنەو روخسار دەداتەوە (....)
***
نیشتمانی من (.....)هۆمیرۆسی چاخ !
دەستاری روح وپەپولە کوشتن ..!
لەم نیشتمانەدا تفەنگ زمانە
زمان گۆڕ شاری تابوتی ئاوە !
(بون ) دایەلۆگی جوگرافیای ونی ئەستێرە ڕەشە .
بۆ گۆڕەشاری مەرگەساتی کۆی

کەوتنە خوارەوەی کۆمەڵەی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە (....)

***

نیشتمانی من (....) جاڕی گەردونی
چیای ئاوێنەی گزنگ بارانی کەللە و مۆخ وگۆشت
شاڵاوی ئێسك و فۆتۆی گڕکانی ژێر خاکە
ڕەنگی سەدان هەزار زنجیری مێشکە نەخشی
دارستانی بسك و کەزیە و قژە سەرە
گڕکانی بون مێژوی لەرزاند!!
جەنگەڵ سوتا!
بۆ سۆو دوکەڵ شیشەی ئاسمانی داپۆشی
هەناسەی دۆژە سەرابی مەمکی دایك
تۆوی ئەستێرەیان تیا چاند(....)!!

***

نیشتمانی من (....) پۆپەشمینی مافی مرۆڤ
خاکی بورکانی تەلێکس
سەتەرلایتی زمان و دەنگ وهێمای دۆزەخ
سەرابی زەریای جەنگی بۆشایی کۆتاییە
لەم نیشتمانەدا ئاوێتەی سەرەو ژێر بونی زەوی دەبن
وێنەی دڕکەزی زمانی ئەڤینی ئەو دایەلۆژەیە
لە پشکۆی خەفەی وشەوە ڕەنگ هەڵدەگرێت
بەبۆنی شۆکەی گەلای ئەتۆم و خەردەل
ڕەنگی بەندیخانە کۆتاکان دەکێشێت (....)

***

نیشتمانی من (....) درەختی سێکس !!

لەم خاکەدا هەور بەمەمکی باران ئاوس دەبێت
گەڵای خەزانی درەختی شەهید
مۆسیقای ئاهەنگی گەڵای گیان دەرچونی گەردونە
سنوری ئەم خاکە گەردەلولی ئێسك وخوێن‌و تەنافی مەمکۆڵەو چاوە
خۆڵ وبەرد زمانی رۆشنبیریان هەیە
مرۆڤ لەبێ دەنگی دا گیان دەدات (....)
***
نیشتمانی من (....) رەمزی ئەشکەوتەکانی ژێر خاکە
پێڵوی هێمای شاردنەوەی عالەمە
لە گۆڕستانی دیدەیا نوقم دەبن
***
نیشتمانی من (....) پانۆرامای جوگرافیای خوێن
گیان و جەستە
لە تابوتی هەوری گۆشتا لێکدابڕان
دۆژە سارای پێکی چرکە
رەنگی خنکاندنی خاك و سروشت و گەردون
هێمای لە بیر چونەوەی تەمەن و روخسارو ئەڤین
وێنەی هەویر ترشی برینی مێژوی زانستی
کۆشکی چەرخی گرانی سیواخ دەدات
ئەم نیشتمانە ئاوازی گریانی بــاوسڕینەوەی مێژوی بونی تیادا دیارە
***
نیشتمانی من (...) کلیلی دەروازەی گەردون
مۆسیقای قفڵ دانی دایە لۆژە !!
تۆوی درەختی پێستە سەر

هەوا شەمەندەفەری تابوت وهێشوی چاویەتی
ئاسمان گۆڕەشاری هەتایی کات ژمێر (....)
***
نیشتمانی من (....) دارستانی نەبون !
نیشتمانی خۆ کوشتنی دایەلۆژە..
ئەلبومی هەور وێنەی جەستەی ئاوێنەی خۆڵ
بە زنجیری زرێ پۆشی (بۆریس یەڵسن)
لە ئاسماندا لە چاپ دەدات
***
نیشتمانی من (....) خاکێکی بزر
چیای ئاوێنەی سوپای زیبەڕۆو مێرو،
تیشکی ئەو هێلکە ئەفسونیەی تیادا وێنا بوە
کە هێمای قڕکردنی جیهانیان هەڵگرتوە
جەنگی سفرو کۆتایی تیا گرێ دەدەن
تیشکی هێلکە گۆشتی (ئۆتۆ) و (تۆسکی ) دەداتەوە
رۆحی (ئیرلەندا) و (نێجیریا) تەریب دەکات
بە تۆڕی ئەفسانەی زمانی خەفەی (فەلەستین)
دەبنە فۆتۆی کۆمپیوتەری (ئەمەریکا) (....)
***
نیشتمانی من (....) تۆری ماتماتیکی جیهان ،
ئاسمانی ئاوێنەی چاخەکانی بەر لەبونەو
هێمای وشك بونەوەی رۆح و جەستە دەخەنە ڕو
لەم خاکەدا رۆح دەبارێت !!
سیناریۆی فلیمی مێژو تۆمار دەبێت (...)

**

**نیشتمانی من ..ئاوێنەبەندی چیای تیشکی هەڵپڕاوی ئەفسانەیە**
**ڕەنگی هەزار دەرمانەی عەتاری چیای ئەتۆمە**
**کرێوەی هێلکە وڵەی خوێنی (هێتلەرە)**
**ڕەنگ ودەنگ وزمان ئاگر دەدات**
**گوڵ وگەڵاو لاسك وێنەی عەرش وشمشێروکورسی تێدایە .**
***
**نیشتمانی من (....) چاڵە خەڵوزی کات ژمێر ...**
**هێمای لەبارچون و نەزۆکی سنوریەتی**
**مەرەکەبی (یەڵسن) و (کلنتۆن) قفڵی دەکات**
**خوێن چڕانی کۆشکی هەور ڕەنگاڵەیەتی**
**هەور سەنتەری ئاپارتمانی دەسەڵاتە**
***
**نیشتمانی من (....) سروشتی خۆشەویستی ئیفلاتونی**
**پزوی ئۆپێرای سەمای چاخی بەرد**
**نیشتمانی کوژانەوەی بون ومێژو**
**ئاهەنگ سازی پۆستاڵ وشمشێر و باروت وداڵ**
**شاری سەمای کەللە پژان**
**لەم خاکەدا وێنا بونی زمان و ڕۆح وجوگرافیا**
**تابوتی گەردەلول و گڕکان و بومەلەرزەیە**
**ئاڵای کۆشکی چاوگی سەرابی گرانی و**
**دۆزەخی ئازادی ودەسەڵاتە (...)**
**
**نیشتمانی من (....) زنجی ئەبەدیەت !!**

زمانی خەففەی ئەشکەوت وکۆشکی قوللەی قاف
سەمای درەختی گۆشت بارانی پایزە
کەشە هەوری لانکە و دەسرازە و مەمەیە
خاکی لە خاچ دانی تابلۆی چاخی سفر
مۆسیقای تەون چنی رۆحی نامۆی بێ جەستەیە
***
نیشتمانی من (...) ئاماری زمان
کۆشکی باڵندەی بێ زمانیە
پوشپەڕی مەزرای مۆرەغە و چاو و پەنجە و ریخۆڵەیە
چیای ئاوێنەی تەلێکس بارانی چەرخی بیست ودوە
لە بارانی کۆبونەوەی داخراوی جیهانەوە
لە جەستەدا شەتڵ دەبێت
لەم خاکەدا هەمو بونێك ناسنامەی هەیە
تەنها کوشتار و ئەڤین ودەسەلات غوربەتین
هەمو تاوانێك پەساپۆرت و شمشێری هەڵگرتوە
زامی بوکێنی وئەڤین وکوشتار بێ پەساپۆرتن (...)
***
نیشتمانی من (....)
جەنگەڵی تیشك
شێی جەنگی سەرتاسەری بەسەردا دێت
تیشکی چیای ئاوێنەی کات ژمێر
خولی سفری چەقی نیشتمانی منە
هەمو هێڵێکی جوگرافیا لە نەبونەوە دێتە (بون )
بۆسۆی درەخت و زمان وهێما

ئەستێرەی کشاوی ساتەوەختی
پانۆرامای تابوتی ئۆقیانوسی ریخۆڵەیە
سرودی کۆشکی نیشتمانی من
هێشوی رەزی گزنگ بارانی کەللە سەر ومۆرەغەیە (...)
***
نیشتمانی من (....) چیای ئاوێنەی تیشکی مۆڵکراو
شێی تابوتی گەلە گورگی بەرکرێوە
مۆسیقای گەلاو ئەشك و تابوت و بـا
گۆڕ و لانکەی هابیل وقابیلی نوێیە
لەم نیشتمانەدا رەنگ دانەوەی رۆح زنجیرە
رەگەزی پەڕۆی بوکێنی دەگرێتە خۆ
ناسنامەی مرۆڤ لەدوای گەڕانەوەی مەرگ دێت
لە قفڵ و باروت ودڵ و زریپۆشا نەخش دەبێت
***
نیشتمانی من (....) کات ژمێری ئێسك
فرۆی هەتاوی مۆڵی رۆژئاوا
جیهانی سێ سەدەی بێ کات ژمێر تۆمار دەکات
کفنی خۆلاوی مێژوی مرۆڤی پۆشیوە
چرکە ئەزەلی زمان لەبێ زمانی دەخاتە گۆ
جەستە لە نەبون دەژیەتەوە!
سێبەر و تیشك وبیرەوەری
هەیکەلی نەوبوکەکانی نیل وفوراتە !
لە ئاوێنەی رەشە گۆشتا مۆمیا دەبن ،
چرکەی ساتە وەختی زمانی (هیمالایا)و

بومە لەرزەی تۆڕی (ئەمەریکا)یە
درەختی رۆژئاوا و رۆژهەلأت دارن دەکات !!
هەمو رەنگێکی ئەم خاکە سروشتی خوێنە
تەنها کۆشکی سەرکردەکان رەنگاڵەیە (...)
***
نیشتمانی من (....) چاڵە خەلۆزی ئەتۆم وخەردەل
زەوی خەزانی بوکە بارانەی
گەلأی بەربای ئەمەریکایە
لەم خاکەدا رەنگ لەباروتەوە دەردێت
رۆح لە لوتا تۆوچێن دەکرێت
چرکە ساتی مایکفۆو سەتەرلایت وراکاڵ
هەیکەلی هەناسەی ئەمەریکایە (...)
لەم وڵاتە کاروانی سەرەتاو کۆتایی مرۆڤ
فەرش رێژ دەکات ،
کلأوە بەرِو رەمزی دارستانێك سەرکردەیە
تەرزە بارانی گەلأ سێبەری کۆشك و کورسی
تونێلە ونەکانی ژێر زەوی دەرِوخێنێت (...)!!
***
نیشتمانی من (....) مەزرای حەشیشەو توتن
نیشتمانی فەنتازیای هەور کێشی چیای ئاوێنەیە ،
دایەلۆژی بەرمرۆڤ وزمانی گوتاری جەستەیە
قژە سەری ئالأی سەروەری یاسایە
ئاماری مێژوی جوگرافیای سوتاوی گەردون (...)
***

نیشتمانی من (....)سەرابی ئەڤین
کات ژمێری ئێسك بارانی کازێوەیە ،
ئاوێنەی روانینی تۆوی کۆرپەی نیاندەرتاڵ !
لەخاکی بەیاری بۆسنەو هێرسك
هەور بخوات ...
راچەنینی رۆحی گەردەلولی ئەفەریقایە
بۆ پزیسکی مەمکی دایك
وێنەی ئاسمان بەئەشکەوتی چاوی بگرێت (...)
***
نیشتمانی من (....) لەم خاکەدا گێژەڵوکەی گۆشت هەڵدەکات
نسیی سەراب سروشت وبون دادەپۆشێت
ئازادی ونان و شیر هەوا حەرام بوە
کۆرپە گڕ پۆشی تفەنگی براکوژی دەمژێت (....)
***
نیشتمانی من (....) کارخانەی رۆح سو
خاکی تەلبەندو قفڵ ودڕکەزی
نیشتمانی ئەبەدیەت وغوربەتی روخساری بەردین
هەمو دەروازەیەکی خڕ داخراوە
تەنها دەرگای پەرۆی خۆکوشتن والآیە
لەم نیشتمانەدا نەشتەر دایەلۆژی روانینە
بە قولآیی سەرابی لێو
بۆ بەردی ئەلحەدو تۆڕی مەمك
تەونی چەقۆی خۆ کوشتن جەستەم دەگرێت
شوشە زێر نەخشەکانی نیشتمان تێك دەشکێن و

بومە لەرزەی چیای ئاوێنە وێنام دەکا
زریانی شوشەی فەرحانم بۆ دەبەستێت (...)
***
نیشتمانی من (....) گۆڕی ژیان ولانکەی مەرگ
ئەفسانەی حەوت چرای دانتی شەوارەیەتی
سەمای هۆمیرۆسی مێژوی تەمەن دەنوسێتەوە
کەفی تواوەی نەهەنگێك هەڵدەمژێت
کە ئەفسانەی کاول بونی جیهان لە چاوی نوسراوە
وەك ئەو هەڵماتە شوشانەی
ئاماژەی هەڵماقۆی ئەفسونی چارەنوس دەکەن
لەم نیشتمانەدا سروشت لە بۆنی مەرگەوە روالەت وەردەگرێت
چاوی چیچان و پورتوگال وئەفەریقا..هتد سروشتیەتی
کەشەی هەوری لێکدابڕاو
پزوی سنوری ئەمەریکا دەبەستێت
رەنگی ئەم خاکە فۆتۆ دەکات
هەمو دەنگێکی دارستان ئێسك بارانی هەڵماقۆیە
لە مۆسیقای جەنگی سفردا قوللەی قاف دەگرن (...)
**
نیشتمانی من (...) کفنی گەلا
بۆشاییەکە میکرۆسکۆپ تەڵخ دەکات
دورگەیەکە مانگی دەست کرد دەترازێنێ
وێنەی برسێتی ئەستێرەیە بۆ رۆژ !
گەلای نمەی درەختی هیتلەرە بۆ نەمرد !!
کرێوەی یەڵسن و کلینتۆن ..

زنجیری دەرگا نەخشەکانی مێژو کلۆم دەدات ؟
ئێستا کاسێتی تراژیدیای تۆڕی ئێسکە
تابوتی جەوهەر دۆدایف ی خستۆتە ناو (بــا)
لەم ساتەدا تەرمی ریخۆڵە و مەمك ومێشك
چوار کوچکەی ئاسمان ڕەنگ دەکەن (...)
***

نیشتمانی من (....) رۆحی شەوەی هەڵگرتوە ..
گۆڕ هەڵکەنی جەستە کۆنەکانی مێژو
گێژەڵوکەی سوتوی جەستە کەوتۆتە خۆڵ (....)
کەرنەڤاڵی لێکدانی مێژوە !!
بوکە بارانەی بۆسنە و نەیجریا وهەرسك و ئەفریقیایە (...)
نیشتمانی من مەرگە ساتی دارستان و تابوتی جیهانی پێیە !
درەخت و زەوی سەرما وەرزی تۆڕی رۆحە ..
نیشتمانی من هێڵی کۆتایی ،
درووی ئاوداری جیهانی پێیە (..)
***
نیشتمانی من (....)ئۆقیانوسی شیری ژاکاو
مانگی دەستکردی چیای ئاوێنە !
چرکەی خەونی جەنگیزخان وکۆشکی نەمرود..
تیشکی بۆسۆی پێشانگای جیهانە بۆ هێتلەر
کاتژمێری لێکدانی مرۆڤ و گەردون !!
ساتی ئەفسانەی هۆمیرۆسی ئایندەیە بە ئێستاوە ..
گوڵە جۆی ئاسمان !
رەنگی شیری دەست و مەمکی کۆرپە
لەم نیشتمانەدا لە دایك بون ومەرگ تابوتە

# گەردونی رۆح

خۆر بەسەر جەستە كۆنینەكاندا هەڵهات (...)
نەشتەری گزنگ دڵۆپەی هەڵڕشت
چەرچەفی گیانی دێرینەی دڕی
لەبەر هەناسەی سەرابی تابوت
هێلكەوڵەی (خوێن) قڵیشی هێنا (..)
ڕەشەبا لەژێر باڵیا لوراندی !!
مژدەبەری سوتانی نەخشەكانی جیهانە
سێبەری هەور تێزابی تیشكی شەونمی سەرگیا
سوتوە مۆرەغەی تواوەی ناو ئاو
كەفی شوشەی رۆح (...)
سێبەری چرای دێر زەمانێكی ونی بێمێژو
درەختی تەمەن گەڵای هەڵفڕی
شنەی خۆر ئاوا تەلیسمی شەوگەرد
مورووی (ئاوداری) كەوتە زرنگە
شەتڵی دێبەری گیانی كۆچەری
گۆپكەی زمانی قەزامی لۆكە
تابوتەكانی، ژێر دەریای مێشك (...)
پەلكە زێڕینەی مردن و ژین بو

پشتێنەی زەوی ژەنگی هەڵهێنا
لەژێر چەترەوە دڵۆپەی مەمکی مانگی کەوتە سەر
خۆڵە پەتانێی پەڕو باڵی خاك
دەریای شەرابی گۆشت وئێسقانە
سەرەتاو کۆتایی پێکی سروتی تەمەنی مژی
مۆمە پەپولەی خاکی بێ مرۆڤ
بو بە قەزوانی ئاسمان وزەوی
لاسکە وەریوی تابوتی باڕەش
لەبیری نوێژی فراژە گیانی قەوزە مەرگەوە
دەشەکێنەوە بەتکە خوێنی گەردونە پێکا
لەناو بانگەشەی کۆتایی وناهێڵێ بێ کۆتا
وێنەی توێکڵی نەخشی مێژو بڕ
تەمی قەوزەیی یەك دەریای نەخشاند
وێنای عالەم کە بە کوێری لە دایك بو (...)
***
لەسەر کۆتایی سێبەرەتاوی سروشتی خنکاو
ئەفسانەی مێشك
بەگڤەی ژەهری بایەکی خوێن گر بلاودەبنەوە
گوڵە جۆ زمانی زەوت کردنی خەرمانی ژینە
زوڕناکان فویان کرد بە هەناسەی فریشتەکانا
ئاودزی هەڵمی سەرابی پایز
شێ گری ڕۆحی گڕکانی سفر (...)
***
پایز شمشێرێکە بۆ داڕنینی گۆپکەی مرۆڤایەتی (...)

هەڵمی پۆشراوی شارای ئەستێرە
نوخشانەی ملوێن زەردێنەی چاوە
هەور هەناسەی پێکی هەناوی هەڵماقۆی گەلا (...)
ناوکی زەوی داری بنێشتی بەر کلۆ بەفرە
لە پزوی حەوت چیندا دەچۆڕێتەوە ..
سروشت تاقیگای دو دلۆپەی شێت ،
ژیان بروسکەی هەزاران هەزار مەلۆی شاراوە
رۆژ چرکە ئەشکی کوژاوەی ناو (بـا) !!
لەنێو ئاسمانی گەردونە قژا (...)
پاسارە کۆچی چاو شارکێ دەبڕێت
دەسرازەی بێشکەی منداڵی خۆرنەدیو...
برژانگە خوێنە !!
فریشتەکان رادەچڵەکێنن
لەوخەوە قولآنەی مۆمیای گەلآیە (..)
لەسەر درەختی خۆڵ باران
شەپۆلە وەستاوەکان بەجێ ناهێڵن (..)
***
جیهان جۆلانەی درەختی ژینە (...)
بوکە شوشەی داپۆشراوی چراو نەخشەی
گۆڕستان و کۆشکی هەورە
هەوا بە بەردەوامی گەردونی ماڵی
جیهان لە نێوان شێتی وشنە با ی کپەوە
مردنی داخراو و ژیانی ئەبەدی
لەتەختەی تابوتێکدا پەرش بۆتەوە

پێستیان دەڕوشێت
وەکو دەریایەك پشیلە درۆزەی ئاسمان بکەن
گەڵای درەختی شەپۆل سروشتی پۆشی
فراژی سەرەتا ناوی مرۆڤایەتی
کاسە خوێنینەی ژیانی رەش کرد
هاواری تەمەن بۆ ئادەم و حەوا:
هەر کەسێکتان مرد لەم رەشبەڵەکەدا دەژیەتەوە.
***
مێژی ژیان روبەری هەزاران جەستەی رزیوە (...)
نیگای ئاوێنەی دەزو هەناسەی بێ ناسنامەی عومر
تەپکەی قۆزاخەی جیهانێکی پڕ ئاگرە
درەخت لەکۆشی باراندا دەتوێتەوە
ئەشکی زریان تروسکەی پایز دەفرێنێت
شەپۆلی سوتاوی (با) قژی ئافرەتێکە
کەوتۆتە بێشکەی منالانی خۆی
بەسەر دەوەنی تاوانا لەدایك دەبێت
شیر گۆپکەی شەهوەتی خۆرە
جیهان نەخشی پەڕەی گوڵ دەکات
پاشماوەی .. تابلۆیەکە بەخوێن نوسراوە (...)
***
لە باکورەوە بۆ باکور (...)
هەزاران تیشکی تەلێکس
شارستانیەتی گۆڕ روناك دەکەنەوە
ژیان ئەشکی نەمری دەڕێژێت

هەزاران دەنگ لە سێڵاوگی سەگەوە
لەژێر زەمینی خەفەی زەریاو خۆڵ
فو بە روخساری گەردوندا دەکەن
دەست بەڕایەڵی خۆرەوە دەگرن
بۆ رزگار بونی ژیانی خواستراو و مۆمیای مردن
هاواری چەند رۆحێك جیهانی هێنایە لەرزە (....)

***

لە ژێر خۆرەوە خەرمانێك مرۆڤ (...)
بانگەشەی شەق بونی ئاسمانیان دەکرد"
ئاسمان زەوی هەڵدەکەند
زەوی گەردونی دەکێڵا ...
گەردون (بون)ی روخاند (...)

***

لە سەر بورجی جیهانەوە (...)
ئاژێری چرکەی مردن کەوتە لێدان!!
باڵندەی گیان هەڵفڕین و لە چرکەیەکدا نیشتنەوە
رۆحەکان بەبێ نەخشە لەچیای ئاویان دەڕوانی
بۆ درەختی ژیانی ئەبەدی
وەکو ئاگری نێو کۆشکی دۆژە
بۆ ژێر چەتری گۆڕستانی هەمیشەیی

***

بڵێسەیەك لە خۆرئاوا (...)
گڕێکی سەوز لە خۆرهەڵات
ئادەم تاجی کەشتییەکی زێوین بو لەخۆرهەڵات

**حەوا بنێشتە تاڵی بەسەردا پەرش دەکرد ..**
**مانگ لانکە بەستی ساوایی دەکردن**
**خۆر کفنی مردنی دەدورین**
**شنەی شەپۆلی دەریا**
**کەفی دوریانی هەڵدەکفاند**
**شەو و رۆژ تێکەڵاوی بێ رەنگی کران**
**وەك جل دەمامکی ئەو هێلکە شەیتانانەی دەکرێنە بەر**
**بۆ شاردنەوەی ئاوێنە زێڕ نەخشەکانی ژیان**
**هێلکەی تەمەن ئاوێتەی میزەڵانی دایك دەبو**
**دەخرایە ناو گۆڕی شوشە**
**چیا هەناسەی**
**سکی زەیستانی پڕ کرد**
**بڵێسەیەکی سور کەشتی ئادەمی لەرزاند**
**بۆ ژوانی کەشتی حەوا**
**دو کەشتی بەبێ جوڵە چرکەی بەستنی مێژو بون**
**زەنگێك لە ژێر ئاڵاو نەکانیانەوە لێدەدرا**
**نەکۆتایی نەسەرەتا** (...)
**ن ەك ۆ ت أ ی ـی**
(...)
**لەگۆڤاری کاروان ژمارە 1999/139 بڵاوبۆتەوە**
**کاتی خۆی ئەم شیعرەم بەعەرەبی نوسی لەگەڵ دیوانی (مرايا الوجود) بەهۆی شێتێتی خۆمەوە سوتاندم لەکاتێکدا کە زۆر کەسایەتی کوردو عەرەب ڕەزامەند بون لەوانە (د. صلاح قەصەب) نوسیبوی (خيالات خصبة يتجول في هاويات**

العاصفة) وه برای ئازیزم اسماعیل حمه أمین زەحمەتی کێشا کردی بەکوردی دوایی خۆم جارێکی تر بەکوردی دامڕشتەوە.

# مەحشەری عیشق

ئای سپێدەی خوێن!!
سڵاوی سەربازی لە کۆچ ( ... )
لە سڕینەوەی زمان و کاروانی مرۆڤ
ئێستا ساتی تێك شکاندنی وێنەیە
داستانی پێچانەوەی ( بون ) و ( مێژو )
گەردونی گومانی ( هایدجەر ) ی ڕاخستوە ( ... )
زمانمان بەبای ڕۆح هەڵدەوەرێ و
چرای ژیانمان خامۆش دەبێت
ئازیزەکەم, ئەفسانەی ئەم مەحشەرە مێژوی نییە
تێزابی وێنەو روخسارە ..
هەوری ئەڤین درەختی ژەهر ئاو دەدا,
ئازیز وەرە, پۆشاکی گومان بپۆشە
لەکڵاو ڕۆژنەی ئەم سپێدە دۆزەخییە ڕزگارببە ..
( بون ) بە وێنەی هەتایی تەمەن ئاڵۆسکاوە
لەچەرخی سفرا وێنەی ئەڤین دەگرینەوە ( ... )
***
ئای مەحشەری عەشق سوتان ( ... )
چی سرێکە هەتاو لەخۆرئاوا هەڵدێت ؟!!
مێژو لە دوای ( بون ) خول دەخوات
چرکەی خاچ و هاتنەوەی ڕۆحی مەسیحە

یاساتی داڕمانی وێنەو روخساری ئەبەدییە ( ... )
لەدوای حەشرەوە دەنگی ئەزەلی دێتە گوێ
چرکەی قفڵ بونی مێژو روخسار و تیشك و ئێرەیە
فو بەئاوێنە زێڕ نەخشەکانی ( بون )دا دەکەن ( ... )
***
ئای لەم شەبیخونی هەتاییە ( ... )
چی ساتێکە ئەگریجەی ئەڤین؟!
میم دەچێنن لەجەستە و ڕۆح و هەناوا
سەدای گریانێکی بێ پەساپۆرت
( بون )ی لەرزاند
خۆرهەڵات و باکور و خۆرئاواو باشور
بە ئەشکی یەکەم مردو شارایەوە
ئازیز بەدرەختی حەواوە ئاڵای عیشقە
منیش کۆتری روەکی ژەهر,
چەقۆی ( شوکران )و گیای نەمری ( بابە نۆئێل )
پەنجەکانمی ئاوساندوە
گومانی ئەم سپێدە بێ زەمەنە
پرسیاری سڕینەوەی ( بون ) و ( روخسار ) و ( هەتاو )ە
چەقۆی ئیبراهیم بمکوژێت؟
یاخود تەوری ( ستالین ) و ( فیرعەون ) و ( نەمرود ) و ( هیتلەر )
یا ئەڤینی ژەهری ( سوقرات ) بۆ فەلسەفە ؟ (...)
***
ئای لەم تۆفانی ئەڤینە ( ... )
دوریانی مەرگ نیشتمانی دڵدارییە

رۆحی ئازیز لەبەر شیری دو دەمدایە (...)
خۆرهەڵات تێزابی روخساریەتی
خۆرئاوا لانکەی مەرگاوی
***
چی زریانێکی ئەفسانەیی عیشقە ئەم عەدەمە؟ (...)
شەپۆلی خوێن تاریك خانەی روخسارمە
قەڵەمەکەم تینوی پیاڵە خوێنی عەشق و
شیری مەمەو ژەهر و خەردەل و کێماوە
تینوی قومە ئاوی رژاوی مێژویەکە
باوکە ( ئادەم ) لەسەر تەرمی ( هابیل ) رشتی (...)
***
ئای لەم کۆتایی مێژوە ( ... )؟!
ئازیز بەکۆچی خۆرئاواوە ئاوابو
قەڵەم ڕەنگی خۆکوشتنی هەڵگرتوە
وێنەی قوڵنگی عەشقی ( فەرهاد ) دەداتەوە
***
ئێستا گەردون وێنەی خەوێکی ئادەمە
بە ئاوێنەی ( لاکان )ەوە سیواخ بوە
لە ئۆتۆمبێلەکەی ( هۆسرڵ )دا جیهان دەبڕێ
لە زمانی ( هایدجەر )دا نیشتەجێیە
ڕەنگی ( دافنشی )و وێنەی عەشق و روخساری نور
جەستەی ئازیز پۆشتە دەکات
ئەگریجەی ئاوێنەی ( نەبون ) تێك دەشکێنێ
لە گۆڕی چاویا دەمنێژێت (...)

***

لەم تاریکستانی نەبونە ( .... )

من و ئازیز تەختەسڕی تەمەنمان هەڵگرت

لەسەر دواچڵی زەمەنی ( نۆئێل ) دەنیشینەوە

***

ئێستا زەمەن بێ مێژوە ( ... )

گەردون بێ وێنەو روخسارە

جەستە بێ رۆح

زمان بێ وشەو دایەلۆژ,

وەرە ئازیز لە جوگرافیای نەبونەوە زمانی ئەڤین بکەینەوە ..

وەرە باچرای خۆشەویستی گەردون هەڵکەین

***

من کەسێکم مێژوی ملیار سەدەم پێیە...

لەسەر بورجی گەردونەوە هاوارێك دێت!!

دەنگی روخانی مێژوە یا ناڵەی عەشق !

سۆزی گریەی ساوایەکی هەڵگرتوە...

وێنەی نایترۆجین و فۆتۆنی سەرەتاوکۆتا..

ئێستا گەردون عەشق و خۆکوشتنی سپی .. سپی

پۆپەشمینی نەفەسێکی منی پێیە

چی ساتێکە ئەم گومانە ئەزەلییە ( ... ) ؟

ئێستا گەردون رەنگی نێرگزێکی سپی ...

(سپی.. سپی)

1997/8/24 دهۆك – سلێمانی

لەگۆڤاری رامان ژمارە 17/ 1997 بلاوبۆتەوە

# زمانی روح

ئەی رۆح نوێژی ئەڤین ( ... )
یاری پەلەقاژەی ساتی گیان چون
ڤیستیڤاڵی زەمەن کاتژمێری گەردون و بونە
جەستە میلی مێژو دەسوڕێنێت
ساتە وەختی رۆح رەشبەڵەکی ئاوێنەیە
لە نسێی ئەشکەوتەکانی دۆزەخەوە دیارن
وێنەی لە تاریك خانەی بوندا دەشۆرێت
تام و ڕەنگ و دەنگ و شێواز سپی کران
مەرگ و ژین و بون و مێژو مادە توانەوە
گەردون ناسنامەی ون بونی تۆی هەڵگرتوە
تیشکێ لەئاوێنەی نیگاتەوە دەردەکەوێت
گلێنەت تێزابی توانەوەی جەستەیە
وێنەی ئەو زەنگە ئەزەلیانەی کلیلی مێژوی ئەم ساتە وەختە
لەچرکەی تۆوی یەکەم مرۆڤەوە زرنگەی دێت
یاری بەسەمفۆنیای دواساتی رۆح بەخشین دەکات

وێنەی سێبەری ئەو گەلا نهێنیانەی
دەریالوشی عەدەم قوتی دان
وێنەی زیبەڕۆی ئەو بۆمبا نایترۆنیانەی
لەجەنگەڵستانی رۆح دا خەفە کران
ئێستا چرکەساتی گەلاڕێزانی رۆح بارانە
نوێژی ئەڤین دابەستە ئەی رۆح ( ... )
وەرە ( ... ), چرکەی کەوتنەخوارەوەی گەردونە...
نوێژی مێژوی ئەم زەمەنە ئاوێتەیە دابەستە
ئەی رۆح ( ... ) وەرە
***
ئەی رۆح ( ... ) شێی بون .. ئاوێنەی نەبون ( ... )
وەرە پانۆرامای رەشبەڵەکی بونە
نوێژی ئەڤینی مێژو داخزان دابەستە
بە ئاوێتەبونی شەو و ڕۆژ و کات,
میحرابی فەرش رێژی خوێن راخراوە...
زەنگی چرۆی خۆڵی جەستەی سەرابی سەرەتا
هەمو رەنگێکیان ئاوێتەی رەنگت کرد
هەمو بونێك پێخەفی خوێناو قفڵی دا ( ... )
بویتە تێزابی کام تەمەنە ؟
چی مێژویەك لەجەستەیدا شەتڵی کردیت؟
میکرۆسکۆب و چاویلکەی زەڕەو کۆمپیوتەر
گەردیلەکانت نابیننەوە .
چی گەردەلولێك تەرمی شتیت؟!
کام حەشرگا زاری گەستیت؟

نوقمی ڕەشەبای چی زریانێکی عەدەم بویت!؟
چی بروسکەیەك لە ڕۆشناییم یاخی کردیت؟
چی ئاسمانێك ئێمەی لەیەکتر شاردەوە ( ... ) ؟
ئێستا گەلاڕێزانی تەمەنە,.
جەستەم بێ تۆ کاتژمێری سفری هەڵگرت
ئەی ڕۆح ( ... ) ئەی بۆشایی گەردون
وەرە بانوێژی ئەم پێشهاتە مێژو سازە دابەستین
***
ئەی رۆح ( ... ) ئاوێنەی نهێنی بون ( ... )
خۆراکی ساتەوەخت" چینی مێژوی بونە
چاپخانەو زەمەن و کامێراو بروسکەو سروشت
بەوێنەی تۆوە, بەجوگرافیای گەردونەوە وێنان
هەڵکەندراون لەسەر جەستەی بەخۆڵ بو
دڵی ئاو و هەوا و ئاسمان و خۆرەتاو و زەوی
یاری نیگای نادیاری شەوەزەنگی تەنهاییتە
ئاوێنەی دارستانی سەراب نەخشاندنی تۆیە
ڕەشەکوژی جەنگەڵی مرۆڤ ڕەمزتە
کوشتنی عەشق زاری تۆیە ...
ئەی تەزوی عەشق بەندی جەستەی مرۆڤ
ئێستا زەمەن زمانی نهێنی بەستراوە
بەڕەنگی شەو و ڕۆژ و رۆح و جەستە تێکەڵ کرا
جیهان لە تاریك خانەی بوندا وێنە دەدات
ئەی رۆح (...)کوانێ هێزو روانین ونەست ؟
وەرە بانوێژی مێژوی ئەم ساتەوەختە دابەستین

***

**ئەی رۆح (...)بەرماڵی مێژوی خوێن راخراوە (...)**
**وەرە سەمای کەللەپژانی دارستانی هەورە !**
**نوێژی کەوتنە خوارەوەی بون دابەستە :**
**ساتێ مۆڵ بون وداخزان وکۆتاییە**
**مرۆڤ کلاوخودەی پۆلا نەخشیان پۆشیوە**
**لەکلاو رۆژنەی ون بونی مێژوەوە**
**ئالای مرۆڤایەتی هەڵدەکەن**
**کامێرای بون کلیلی زمانی بێ زمانییە**
**هەمو زمانێك لەشەختەدا هەڵدەکەنێت**
**رەمزی گەلاجاڕی دارنینی بون دەردەخەن**
**کاتژمێری ئاماری کۆتایی روانین**
**بوخچەی گەلای نهێنی بێ زمانی دەکەنەوە**
**لەم ساتەدا هەمو زمانێك بێ شێوازە**
**بەگەلای خۆڵی جەستەی خاکەوە وێنایە**
**پریاسکەی نهێنی رۆح هەڵدەکەنێت**
**وەرە ..وەرە ئەی رۆح ساتی قەدەرە**
**بانوێژی مێژوی بێ ناونیشانی دابەستین**
***

**ئەی رۆح (...) زمانی نەزانراو(...)**
**بون لە گێژاوی زەریای نەبوندایە**
**زەمەن تێکەلاو کراوە**
**ئالات پەتی سێدارەی ساتەوەختە**
**ناسنامەت تەمەنی مەرگی مرۆڤایەتی هەڵ گرتوە**
**مەرگ پێوەندی رۆحە بۆ جەستە**
**سزا وێنەی نادیاری رۆح وبونە**

بون لە جەستەیدا مێژوی خنکاند
تەمەن لە نهێنی رۆحدا توایەوە
شەپۆلی خوێن دەفتەری ژینی هەڵوەراند
نهێنی جەستە نەخشەو جوگرافیای شتەوە
خۆڵی گۆڕستان زمانی رۆحی تیا خەفە بو
هەمو بونێك كای سەرملەی نەبونی زەمەنی سفرە (...)
***
ئەی رۆح (...) شوێنەوارت سڕایەوە
لەچی مەنزڵگەیەكدا ژوان بگرین؟
زەوی لە ئاوێنەی تۆدا سوتا
تێزابی نادیاریت هەمو بونی تواندەوە
ئاسمان وەك ناوت بێ ناونیشانە
گەردون رەمزی كەوتنە خوارەوەو داخزانتە
وەرە ئەی رۆح (...) وەرە (...) هەوێنی بون
نوێژی ئەم مێژوە دابیەستە (...)
***
ئەی رۆح (...) ئەی ئاماری بون (...)
كلیلی مادەو رۆح لە كلاورۆژنەی رۆژو شەودایە
رەنگی كەوتنە خوارەوەی رۆح و جەستە دەداتەوە
سەمفۆنیای چركە زاری زەمەنی هەڵدڕی
ئیزرائیلی چاخ دەستی بە كوشتار سپییە
ئەندامەكانی ڤیستیڤاڵ رێیان هەڵگرت
تەنیا من و تۆ لەم زریانە لێك دابڕاین
دەستت بێنە رێبواری سەفەری نەهات
چرای ژین بە خوێنت دەگرێت
لەون بونی تۆوە مێژو سوتاو

له كوژرانی زمانتەوە گەردون ون بو
وەرە ئەی چرای جەستە .. وەرە
هێزو چاو و نەستت (...)
وەرە ئەی رۆح یاری پانۆرامای جەنگەڵ
بون و مێژو هێلکەیەکی تێك شکاوە
وەرە با نوێژی ئەم زەمەنە نادیارە دابیەستین
وەرە ئەی رۆح .. ئەی رۆح (...)
له میحرابی خوێندا نوێژی مێژودابیەستە (...)

---

لەگۆڤاری رامان ژمارە 1997/7 دا بلاوبۆتەوە

# رۆحی مێژو

ئای .. هەرەسهێنانی عەشق سڵاو لە کۆچ
سڵاو لە شوێنەواری کوشتار گەیەکی بەر لە (بون)
چی گەردونێکی لەدوای (نەبون)ەوە جێهێشتوە؟!
ئەفسانەی (بون) دۆژەی خۆرهەڵات ورۆژئاوایە
گێژەڵوکەی رۆحی مێژوی هەڵگرتوە
ئێستا سڵاوی سەربازی چەرچەفی بۆشایی پۆشیوە
مەرگ ولەدایك بونەوەی داخست
ئەم چرکەیە کەوتنە خوارەوەی ئەستێرەو کۆمەڵەی رۆژ
بەرو پۆی بۆشاییەوە گڵۆپی شەوارە هەڵدەکەن
گەڵاریزانی چرکە ئەبەدییەکانی زریانی رۆح
مەمکی سروشتی وشك کرد
چی ساتێکە گەردون بەخوێنی مەمەیەکی پڕاو تینو بوە
تابلۆی کۆتایی (زەمەن) و (بون)ی نەخشاندوە
***
ئای دارستانی ئەفسونی روخسارو مێژو
سڵاو لەو جەستە مۆمیایانەی لە دوای (نەبون) دەژێنەوە

ئەفسانەی رۆح بە نەخشەی گەردونێك وێنابوە
تیشکی ئاوێنە فەلسەفیەکان دەردەخات ..
ئەم چرکەیە کەوتنە خوارەوەی وێنەیە لە (وێنە) دا
هەور کەپری وشك بونەوەی گرانی زەوییە
جیهان بە ژەهری فەلسەفە ئاو دەدات ..
چی ساتێکە سروشت کفنێکی دڕیوە ...؟
بەفرو تەرزە گرانی ئەم چەرخەسپی ناکات
زەمەن پزوی داڵەکەرخۆرەیەکە لە ڕۆژئاوا
زامی رۆحە هەتاییەکان لە زریانی زانستیدا ناکوژێنەوە
سروشت ئێستا لە تابوتێکا کۆچی کرد
پلیکانەی (بون)ی رماند
گەردون هێلکەیەکی فلیقاوەی بێ مێژوە
رەنگی پیاڵە خوێنێکی دوای بای نەفخە
مێژو تینوی دڵۆپە خوێنی جەستەیەکی رزیوە
مەمکێکی سێوی ئادەمە
ئەوی تریش نایترۆجینی کۆتاییە
ئەم چرکەیە ..ئەم چرکەیە (...)

***

ئای سپێدەی رۆحە هەتاییەکانی تونێلی خاك
سلاوی خوێن و بۆمبا نهێنییەکانی (بون)
ئێستا دەستی سلاوی سەربازی کشا
خوێن ناسنامەو روخسارو عەشقی سڕییەوە
جوگرافیای رۆح بەلافاوی (نەبون)ەوە نوقم کرا
ئێستا نیگا بەدۆژەی تاریك خانە وشك کرا

سەدەی کەتنە خوارەوەی جەستەیە لەروخساردا
(بون) و (وێنە) لەمێژوا هەرەسیان هێنا
ئەمڕۆ هەتاو بەسەر جەستەیەکدا هەڵهات
لانکەو گۆڕی بەر لە (بون) و دوای (نەبون)ی سازاندوە
ئێستا مانگ خەرمانەی چاوێکی سیحراوییە
جیهان لە هێلکەی خوێندا نەخش دەکات
گەردون پەتی سێدارەی مەلێکی هەتاییە
کە مێژوی بە مێژو خنکاند!!
***
ئای سپێدە نهێنییەکانی (بون) سڵاو..
سڵاو لە تەمەنی سەر بڕینی عەشق
لەو زەمەنە داخراوەی بۆشایی رەنگ دەکات
ئێستا داڵێك رەنگی مەرگی شێوەی هەڵهێناوە
(جوگرافیای) (بون) لە (نەبون)ی ئافراندوە
(بون) و (نەبون) لە زەریای خوێندا نوقم بون
ئای سپێدە هەتاییەکان!!
تەوری زەمەن گلۆپی شەوارەی ساتەوەختە
عەشق پیاڵە ژەهری سوقرات وفەلسەفەو (بون)ە
دەرژێتە مەمکی درەختی دایکەوە
مێژو بەفری سڕینەوەی بۆشاییە لە (نەبون)دا
ئەم چرکەیەی مێژو بەمێژو سەردەبڕێت.
گەردون لە هەناسەی چۆلەکەیەکدا خەفەبوە
ئەم چرکەیە ساتی کەوتنە خوارەوەو داڕمانە
چرکەساتی تەقینەوەی روخساری هەتایی مێژوە

**زەمەن تینوی پیاڵە ژەهری فەلسەفەیە**
**ئەم چرکەیە ..ئەم چرکەیە..**
**پیاڵە ژەهری فەلسەفەیە ..ئەم چرکەیە...**

**لەگۆڤاری کاروان 134/ 1999بڵاوبۆتەوە**

# مێژوی سفر

**کات ژمێر سفر... مێژو سفر** (...)
**خەنجەری خوێن ئاسمان و زەوی هەڵدڕی!**
**خۆر کۆچی کرد!!**
**ڕۆح لەسەر جەستە هەڵفڕی!**
**هەورو هەوا پەتی سێدارەیان هەڵدا!!**
**مێژوی جیهان قفڵ درا**
**قژە سەری هەڵەبشیما گەردونی گرت** (...) !!

***

**کات ژمێر سفر ومێژو سفر** (...) !!
**گەلاً ڕێزانی تراژیدیای ڕۆح!**
**بەتاوە تەرزەی جەستە بارانا دەچێتە ئاسمان!!**
**سەرەتاو کۆتای مێژو بون بەیەك**
**قوربانی نەبو بۆ هەڵەبجەکەم** (...)!

***

**کات ژمێر سفر ... مێژو سفر** (...)
**شەش ساڵ ڕۆژە ...**
**هەڵەبجەکەم..**
**هەناسەی. شیمیابارانت خۆر دەدوێنێ!**
**دادگەرەکان لەگەڵ تۆدا خرانە چاڵ!!**

**ئالآی مافی مرۆڤ سوتا!**

**جیهان کەڕو نابینایە**

**ئایا سروشت لە تاوانی تۆ دەپرسێ؟** (...)

***

**کات ژمێر سفر ..مێژو سفر** (...)

**لەم ساتەدا گۆڕستانێکی ئەبەدی**

**کەرنەڤالی کەللە سەرو پەنجەو ڕۆحە!!**

**گڕوگاڵی مەمکەخۆرانی سەرگزنگ**

**بەمۆسیقای مەرگەساتی هەتاییەوە**

**ژینی هەژاند!!**

**چەقی نیوەی مێژوی ئێمە**

**ئالآی لێرەدا هەڵکرا!** (...)

***

**کات ژمێر سفر .. مێژو سفر** (...)

**ئەم سەدەیە وەکو مریەم**

**وەکو مەسیح لە ئینجیلدا تۆمار نەکرایت؟!**

**شەش ساڵڕۆژە**

**تابلۆی دۆزەخت دەخرێتە ڕو**

**پەیام نێران کەوتنە پرسیار ؟**

**چەند جار جیهان گێژەنگی ادا**

**فلیمەکەی هەڵەبشیما مێژوی پۆشی** (...)!!

****************************************

**لە گۆڤاری پەیامی راستی ژمارە 41/1996دا بلاّوبۆتەوە**

له رۆژنامەی 1996/3/16 ی سەرنوسەر سەلام مستەفا جارێکی تر بلاوبۆتەوە

# نەفخی سور

کۆتایی بون (...)
(ئێستا ئاسمان وەك سەرەتا سپی (1) (...)
(بون) و (مێژو) (...) قفلّ درا!!
کاتژمێری رۆح تێزابی هەڵەبشیما
میلی مێژوی خستە چرکە (..)

***

کۆتایی بون (...)
خۆرئاوا تەمی سپی (...)
تەنی مادی (بون) و (گەردون) توایەوە...
دوکەلێکی سپی سپی بۆتە پۆشاك
زەمەن مێژوی مۆمیابونە
(مێژو) گەردەلولی (سروشت) و (بون) (...)
(رۆح) و(جەستە) لە تێزابی بونا جوت بون(...)
(ئێستا ئاسمان وەك سەرەتا سپی سپی )
رۆح تۆو چەنی شیمیاباران

**خاك هەڵم و گڕ(...)**
**کۆمەڵەی ڕۆژ دوکەڵی سور..**
**بۆشایی بو بە هەوری رۆح**
**سەمای شیلاوگی هێرۆشیما و هەڵەبشیما**
**بون بەڕەنگی مێژوی (گەردون)(...)**

***

**کۆتایی بون(...)**
**گەردون تێزابی جوگرافیا**
**بای نەفخی سور (بون) و (مێژوی) کفن (بــا) کرد..**
**(ئێستا ئاسمان سپی سپی وەك سەرەتا)**
**ئاو و  هەواو خۆڵ و مێژو سپی سپی (...)**
**تەنیا شانۆی هەڵەبشیما و هێرۆشیما(...)**
**گڕوبۆسۆ و دوکەڵی سور (...)**

***

**کۆتایی بون (...)**
**(ئێستا ئاسمان سپی  سپی وەك سەرەتا)**
**تەنی ماددی تێزاب رۆحی (بون) و (جەستە)**
**ڕۆح بە جەستەو جەستە بەرۆح گەیشتەوە**
**زەوی خۆی بە ئاسمان بەخشی**
**ملیار ملیار رۆح و جەستە زاریان پژا (...)**
**شارا رۆحی هەڵەبشیما وهێرۆشیما بێناسنامە و جەستە فڕین**
**ڕۆح بێ زمان**
**جەستە بێ بون (...)**
**ڕۆح لە جەستە و جەستە لە رۆح تەریو ببو(...)**

***

کۆتایی بون(...)

(ئێستا ئاسمان وەك سەرەتا سپی سپی )

کاتژمێر وکات وشوێن ساڵنامەکان

سپی سپی (...)

چی ساتێکی ئاوێتەیە؟

قەڵەم لە کاغەز یاخی‌یە

عەشق لە دڵ

هەور لە هەڵم

هەڵم لە ئاو(...)

شارای رۆحی هەڵەبشیما و هێرۆشیما

لە خەردەل وجەستەو بونیان (...)

چی ساتێکە ؟(...)

تەرازوی ژین وێنەی شیمیا

هەڵەبشیما وهێرۆشیما وێنەو زەمەنی بۆشایی (...)

ئاڵاو رۆح و خوێنی گەردون(...)

***

کۆتایی بون (...)

(ئێستا ئاسمان وەك سەرەتا سپی سپی )

کێو و چیا کای کوتراوە (2)

بون با ڕێزەی شارە مێروی تەونی مێژو

گەردون هەڵماتە شوشەی بەفر (....)

هەڵەبشیما و هێرۆشیما جەستە هەڵم (...)

رۆح شاڵاوی گڕو بۆسۆ و دوکەڵی سور (...)

... ڕۆژی حەشرە ... بای نەفخی سور ...
جەستە لە ڕۆحدا بزربو
(ئێستا ئاسمان وەك سەرەتا سپی سپی )
سپی سپی وەك سەرەتا (...)

---

(1)ئاماژەیە بە ئایەتی (یوم نطوي السماء كطي السجل للكتب كما بدأنا أول خلـــــــــــــــــــــــــــــق نعيـــــــــــــــــــــــــــــد)
(أية 103 سورة الأنبياء)

(2)ئاماژەیـە بـە ئایـەتی (وتكـون الجبـال كـالعهن المنفـوش) (سـورة القارعـة) لەرۆژنامەی یەکگرتو 1997/3/16 ژماری 129 بلاوبۆتەوە

(3) رەخنـەگر (نـەوزاد عەبـدول) خوێندنەوەیـەکی قـوڵی لەسـەر ئـەم شـیعرە کـردوە (خوێندنەوەیـەك بـۆ نـەفخی سـور) لەرۆژنامـەی برایـەتی ژمـارە 20178/ 1999 بلاوبۆتەوە.

# زەڕەبینی تەرمی زیندو

ئای بۆ کەپولەی پڕ لەهەناسەی ئاواتێکی وێڵ (..)
چاوگی سەراب خەوی مەحشەری دەرونی تەقاند
پێلو پریشکی شەونمی کفنی لالەی بەیانی
چرۆی بێ سوتو کەوتۆتە بەر (با)
پەپولەی عاشق کەشکۆڵی شیعری شاعیرێکی وێڵ
لەعەشقی بەردە باڕێزی تەمی مردنا نوقمە (...)
ئەمشەو ئاپورەی هەناسەی خنکاو
چرکەی ون بونی سەهۆڵ بەندانی هەزاران تەرم
دیدە چرکەی شارێکی مەحشەری بایە
دەریای ئەزەلی تەمەنی دوایی چاوگەی خوێن چون
تەنها شارێکی نەخشەی جیهانی گەمارۆ داوە
لەپێلوی مەستی دو چاوا نوستو
ئەمشەو پەیکەرێك جەستەی گەردونی بونی پۆشیوە
فرمێسکی خوێناو دەڕژێتە بای سور

ئەو زرنگانەی لەگوێیەوە دێت
ئەستێرە خوێن سوی پەرچەمی کوردە
چیای روانینی سەمفۆنیای چرکەی کورە هەنگێکە (. . .)
زمانی جەستەی هەڵەبجە شیمای هەوری دەست کردن
***
ئەمشەو ئەستێرە گەڵا ڕێزانی خەزانی خۆرە (.. .)
تابلۆیەك هەوری مردنو تەمی سیمای ون بونە
فرمێسکی وێنە سێو ژەهر خوێنی جگەری هەواو ..
نەفەسی خەفەی شارێکی زیندو
روپۆ و کەناری دەست و کەللەسەر
برژانگی وەریو زەوی دەکێڵێت
لەسێوی حەواو ئادەمی چەرخا
نیگای هۆمیرۆس تەلەسکۆبی سەر تەرمی زیندوە (..)
بەپەڵەی دایكو باوکی سەرەتا زمانی کێوە
وشەو زمانو گڕوگاڵی خوێن بەقەدیا لچکا..
ئەمشەو بارانی جەستەی تواوەی دەوەن شیعرێکە
گڵمتەی خاکی سور باو دەشۆرێت
لێزمەی زمانی ئاڤێستای چەرخە
زرنگەی زیندو بۆ نەوەی گیانی کۆتایی حەشرە
ئاو تاڤگە کەفی دەچڕایە سەر درەختی گزنگ
تکە دەرژایە سەر زامە خوێنی ناوکی زەوی
ئەمشەو زرنگەی ئەو زەنگانەیە کە تەز بەندی پەیکەری جەستەن
زەوی چاوی رشت بەتکەی تەرمی زیندوی دوا چەرخ
ژیان لەهێلی سفرا پیانۆی ژەند

ئەو بروسکانەی لە تەلەفۆنی سکی هەورەوە
بانگەشەی مەرگ‌و ژیانیان هەڵدا
بون بە کڵپەو گڕ لە ناو  خەرمانەی دێبەری گیاندا (..)
***
ئەمشەو گوڵ و سۆز گڕوگاڵی دەریای رۆحی خەفە بوە
شارای گیانی کۆچەری لە دوایەوە هەڵفڕین
باڵە فڕەی ئەفسانەیی کەوتە شەپۆل
ئێستا گەردون ویڵی چەقۆی خۆکوشتنی شاعیرێکە
سۆمای گیانی فریشتەی خوێنیش کەوتۆتە سەر رێ
پەلکە زێڕینەی سەربازی شاراوەی خۆڵ
بو بەمەشخەڵی خۆکوشتن
هەزاران دەست لەڕوبەری نەشتەردایە
هەتا مۆمێکی نوێ لەمێژودا هەڵ بگیرسێت (. . .)
***
ئەمشەو هەناسەی خواو گریەو زەنگی ساوا تێکەڵ بوە ( ...)
تابوتی دەریای سپی کەوتە سەر شالاوی خۆڕسکا!
ئەمشەو من تەنها خۆ کوژی ئەم گەرداوەم
ئەستێرەی ئاسمانی دڵداری لەزرگرتی
خوێنم کەفی خۆکوشتنی سوتا
شاعیرێکی ئافراندەوە (...)
خڕۆکەی خوێنی بورکانی هەتایی هەورە
زەنگی کۆتایی وشەو زمان
بەسەر تەلی دار تابوت‌و زڕە خەوی درەختی خاك
زەنگۆڵەی بای دڵی ئاوە

شارای گۆڕستان دڵی نیشتمانی کەوتە خورپە
نامەی بەخۆڵ بونو لەدایك بون
گەیشتە سەر ملەی کفنی جیهان
شەو و ڕۆژ کفنیان دڕا
تەرمی درەختی هەورو با بون بەدەریا
ئاپورەی شێی پەردەی ئاسمانی چاوی ژینە
شێوەکاری تابلۆی ڤان کوخو ئەنجیلۆی تیا سفر بو
مێشکی سروشت پژاوەتە ناو کۆشی با
فۆتۆی دەستو پەنجەی شارێکی ون لەجەستەدا دەگرێتەوە
کۆرپەی چرۆی ژەهر گرتو لە کەشەیدا دادەچۆڕێت (. . .)
***
ئەمشەو وڵات زیندە بەچاڵی دڵدارێکی هاوچرکەیە
چاو دەبڕێتە ئەو کاروانەی لەئاسماندا گوڵ تۆو دەکات
زەنگی لەدایك بونی دەریای خوێنینی هەژارێکە
نیشتمانەکەی خۆی کوشتی لەباوەشیا پێچایەوە (..)
***
ئەمشەو وڵات ڕەشبەڵەکی ئەفسانەیی مەرگو ژینە
کاروانێك بەدوای گۆڕستانەوە ڕێگە دەبڕن
دەریاش شارای ئەشکی ساوا
گەردونی نهێنی ڕۆح بەندەنێکە
لە گڕکانی خۆشەویستی گزنگ دەدا بەسەر پەرچەمی خوێناوا
***
ئەمشەو دەریاچەی ژین گڕیان گرتو (...)
خوێنی زەوی بو بەگڕی وشەو زمان

شاعیر مردو کەوتە داوی ئەفسونەوە
وشەکانی شەرەفنامە بون بەشەستەی رۆحی تازە
ئەمشەو شاعیر چوە پەساپۆرتی دڵی نیشتمان‌و
شەرەفنامە لەفەزای مەرگا پەخش دەکات
کاراکتەری شەرەفنامە لەگەڵ پەلکە زێڕینەی بەیاندا
لەدو جیهاندا رێ دەبڕن
ئەمشەو هەوری شەرەفنامە
تورەیی خوا دەبارێنێ بەسەر کورسی دەسەڵاتا!!

***

ئەمشەو ئاسمانی دڵداری دا دەڕوخێت (...)
بروسکەی خوێن دەگرێتە جەستەی هۆمیرۆس
فریشتەی دڵداری هەتایی دەجریوێنێت
دڵی گۆڕستانی خاکە
خاک گۆڕێکی هەتاییە
ئاسمان تەرم‌و تەختەو تابوت‌و گۆڕهەڵکەن
خاک تەرمی مردنی مێشهەنگ
سۆمای گڕوگاڵی ساوا
زمانی دڵی دڵدارانی دورەڕێیە

***

ئەمشەو ئاسمان هێلنج دەدات
زەوی لەچارۆکەی خۆشەویستی هەتاییدا گرێ درا
پرچی دارستانی شاردنەوەی زمانی سۆزی دڵدارە
کوردستان زمانی عەشقە شێتەی دایەیەکە
زمانی دڵی عاشقی بێ زمانی دەریای عەشقە

دایە یەکە ڕۆڵەکانی سۆمای خوێنیان کەوتۆتە کەف
گرێی ئۆدیبیان پچڕاوە
درەختی سەوز ئەشکی لەدایك بون دەڕژێت
تەنیا خۆشەویستی پێلوی شوشەی گریەکانە
فرمێسك دەڕژێتە گەردونی دایەو منداڵ
بۆتە شەوە گەڵای ژینی دەوەرێنێ
لە دادگای ئەهریمەندا خۆی راوەشاند:
با لەباوەشما زیندوبن چەقۆی ژیان نەیان کوژێت (...)
***
ئەمشەو هەوا کەوتە بەر دادگای عەشقی کێوی (....)
پرچی ڕنی!
ئاسمان سێدارەی بۆ هەڵدا
ئەستێرەیەك باڵای سورکرد
ئەویش چوە سەر هێڵی نەفخی سور
چاوی هەڵکەند!!
قەت نامەوێت جارێکی‌تر قژی هەڵەبجە دابێنم (...)
***
ئەمشەو چاوی گەردون فەزای پۆشی
جەستەی بەبای زریانی خۆر شیتەڵ کرا
لە خۆی پرسی؟!
بو بەهەیکەلی مۆمیای تەمەن (...)
پێلوی داهێڵرایە سەر خاك
گۆڕی شوشەی هەوری زەوی ئەسیری کرد (. . .)
***

ئەمشەو جیهان لە گیانەڵای مەرگ‌و لەدایك بوندایە (. . .)
کاروانی سیبریای رۆح کەوتە سەر رێ
فریشتەی جەنگەڵی مەرگ.. زەنگیان لێدا
فلیمێك بو بەرەوتی خۆرهەڵاتی نوێ
نێرو مێ بەدەسرازە چاویان هەڵهات
پەردەی ئەفسون بەبای کابوس چاوی رشتن
لەم نیشتمانە وێڵەوە
لەدۆزەخی پڕ بورکانی ئەوێنەوە
کچ‌و کوڕ خەر تەنەکران!!
گرێی ئۆدیب لەخوێنیاندا کوژایەوە
منداڵانی پەساپۆرتی مردنی شەو
لەگەڵ چرکەی ترازانی خاك‌و دایەو بادا
لەتۆڕی کابوس رەنگ دەکرێن
لەم خاکەدا تیۆر زانی فرۆئیدو جاك لاکان و لیڤ شتراوس
ماسی بیابانی بێ دڵدارین
کودەتای زمانی جەستەی دەریای کابوس
شۆڕشێکە بۆ کوشتنی خوێنی لافاوی ئازادی (. . .)
**
ئێستا جەستە سەهۆڵ بەندانی تابوتی نیوەشەوە (. . .)
بێ زمانە
بۆتە مورووی ئاوداری دارستان
زمان تەنیا زمانێکە
پێستی فۆتۆ لەجەستەدا دادەماڵێت (. . .)!!
***

ئەمشەو سامالٌ لەسەر خونچە شەوق دەڕژێت (. . .)

نەشتەر لەسکی گەڵای وەریو دەدات!

شۆخێك لەسەر لوتکەی وڵاتێکا کەوتە قسە:

چاوی لەتاڤگەی شەهوەتو زامو ئۆدیب نوقاند

لەکاروانی نێر و مێدا هەردو گلێنەی دەرهانی

لەدوا پەلەقاژەی مەرگا بریسکەیدا

من نازانم نێرم یان مێ؟!

لەبەندیخانەی کابوسدا وشك کرام (. . .)

***

ئەمشەو گەڵاریزانی جەستەیەو جۆزەردانە (. . .)

گیان لەژێر خاکا چرۆ دەکات!

مارشی ئاهەنگی هەزاران گۆڕستانی ژێر لوتکەیە

هەژار (1) لەسەر تەنافی ئەڵقە ڕیزی مردندایە!

چرکەیەکە لەرابردو مردنێکی داهاتودا

هۆمیرۆسی ئەم نیشتمانەیە

ئۆرکسترای گیان دەرچونی هەڵەبجەیە!

چاویلکەی شێی لەچاودایە شەرەفنامەی چاخی ئێستا لەچاپ دەدات

ئەم چرکەیە بەفرماڵی دیدەی سەرەتاو کۆتایی گەردونە

فلیمێکە وێنەی زەوی دەشواتەوە

لەم ساتەدا هەور دەگرێت

ژانەکانی منو شەباب (2) دەخواتەوە

منو شەباب لەم شارەدا زەڕەنەقوتەین

لەبەر تەرزەی مێشکا نوستوین

چرکەیەکە چاومان بۆتە چۆڕاوگەی مێشك

هەژار ئێستا وێنەی منو شەبابو هەڵەبجەو نیشتمان!
کوردستان وێنەی مەرگی هەمومانە
لەچاوی هەژاردا وێڵین
گیان دەدەینو دەژێینەوە
مۆسیقای خوێن ئەم زەوییە دەهەژێنێت

***

ئەمشەو ساتی داڕمانی چیای ئاوە!
ئاسمان لەگەردونی تواوەدا دادەڕوخێت
جەستە کانیاوی وشەو زمان
لافاوی نوێ فەزای وڵات دادەپۆشێت
لەم ساتەدا شەرەفنامە لەچاپ درا
منو شەبابو هەڵە بشیماو جیهان
ئاوازی تاتە شۆری مۆسیقای خوێنی گەردونین
زەنگەکانی ئەم رۆژگارە کەوتنە شاڵاو
تەنها تابوتێکی زیندو بەرهات
لەگەڵ رۆحی خەفە لەدایك بو
دوا سرودی کودەتای خۆر دەڵێتەوە.

1992/6/22 سلێمانی

1-هەژار: هەژار موکریانی شاعیرو وەرگێڕو نوسەری بەناوبانگ.
2-شەباب: شێتێکە لەشاری سلێمانی

# خوێن دامان

چرکەیەکە زەوی خوێن دامانی کەشەی هەورە
هێشوی ئەستێرەی گۆڕستان!
فۆتۆی وەرینی رۆحی چاخ
گلێنەی چاو لە تابوتی خۆرا ڕزی!
زەریای گەلا ریزانی مێژوی خوێن
گەردەلولی مەکی ئەستێرەی داکشاو
ئەشك ریژی چیای سەربازی نەورۆزە
گولە جۆ ئاسمانی دار تابوتە!!
ئەستێرەی ژێر پۆستاڵی با ئاوێنە نەخش
شاری مەرگ لە جەنگەڵی چاوا دەڕوێت !
مێژو ئەفسانەی رۆحی کشاوی نیشتمانە
وشکە خوێنی تەناف و تابوت و شمشێر
مردو زیندو مۆسیقای رۆحی گەر دەلول!
پەردەی نیشتمان رەشپۆشە
بروسکەوی رۆح گڕی کانیاوی خۆرە تاو
کەشتی ئاسمانی خوێن دامان
دۆژە سارای هەزارەها رۆحی خەفە
مێژوی تابلۆی یەك نەورۆزە!!

نەورۆز 1993

# تەزوی ترازاوی مەرگ

شەوچڕ تەمەنی رۆژگارە..
هەناسە ئەشكی یاقوتی پایز
كۆچی شارای گیانو جەستە
لە دۆژەی فرمێسكا خەفە كرا
رێزە هەناسەی باڕێزە
پەڵەی بوكێنی ژیان دەشوات
تەمەنی كەفی دەریایەكە"
لە هەناسەی رەشەبایا نوقم بوە!
دۆزەخی چاو گەردەلولە
بەستەڵۆكی رۆح دەپێچێت!
ئاهی یاقوت گەرو سوە
لە منداڵدانی مردنا چرۆ دەكات!
ئازیزەكەم تێر تێڕ بنو..
لە جیهانی دڵا وێڵ بویت
بۆیە مایتو منیش خۆم كوشت (...)

***

ئەمشەو چركەو زەمەن سفرن
لەم ساتەدا هەتاو هەڵهات
تكە خوێنی سیامەرگ
ئاوێنەی نەشتەری دڵمە

لەم ساتەدا خۆری رۆحم سەر بڕاوە
دەریای خوێناو لە کەفدایە
شێوە تیشکی گەرمەسێر دێت
زرنگەی زەنگی سکی بایە
خۆر منداڵدانی شەوە زەنگە
من عاشقم (..) جەستەم تەرمی شەو و ڕۆژە
خاك چار چێوی سپێدەیە
نیشتمانم کەللە سەری گۆڕێکی بێ ئاسەوارە
هەوا پەردەی نیوە شەوانی گوناهو
سك دڕاوانی بەر ئاگرو چەقۆ و قەممە و  بر وسکەیە
گوڵ کفن چڕی هەتاو و مەرگ
من و مردن گۆشت و خوێنین
ئێستا تەرزە بارانی ئاورینگە
شەونم نەمامی خوێن هەڵکێش
گەردون سەرابی گیان چونە
منو مردن هەورو باران
گیانمان لە نیشتمان وێڵە!
تەزوی ئۆقیانوسێکی سەر بڕاو
من و مردن زەنگی رۆحی تاقە گۆڕێکی هەتایین!
تەزوی گیانی پەلکە زێڕینەی هەتاوێك
لە کلاْفەی عەشقی کۆتایا خەفەیە
عەشق وێڵی گەردونێکی تواوەیە
منو مردن
زرنگەی ئەو فرمێسکانەین
دەریای ئەوێنیان گڕکانە!
گیانمان پەپولەی هەوری بایە !
سەفەر دەکەین بۆ ناو گۆڕی دەریای عەشق!!

دو جەستەی وشکی تواوە گیانمان عەشقە!
لە پەنجەرەی عەشق یاخین
عەشق گڕی خوێن چونی ڕۆح!
من و عەشق و مەرگ دابڕاوین (...)
عەشق پارچەی ترازاوی بۆشاییە
ئەستێرەیە بەسەر من و مەرگا هەڵدێت (...)

# بورکانە خەفەکانی رۆح

ئەمشەو پایز بوکی هەرچوار وەرزی ساڵە
تروسکەی شاری تەنیایی دێجورێکە“
قامچی دەدات
لە بورکانی ئەڵقە ڕێزی رۆحی خەفە!!
خۆر تابوتی فریشتەیەکی دزێوە
بەندیخانەی ماڵ بە ماڵی شار دەگەڕێ
تەختەی بێشکە بۆ ئاگری زەماوەند کۆ دەکاتەوە!!
ئەمشەو شار بێ پاسەوانە
گوێ قولاّخی زەنگی سکی دایکەکانە!
گریان لە گەروی دارەوە دێتە دەرێ
هەوا بەدەم گڕو گاڵی منداڵەوە یاری دەکات!!
مانگ کۆتەڵی دزێوی تاریکە،
توخبەی زێوینی کەوتۆتە بەر ڕەشەبا
خۆر سێبەری نسێی خەوی منداڵێکە
پەردەی هەمو ئاسمانەکان بەسەریەوە دادڕاوە!
بەسەر تەرمی گوڵێکەوە ئەشك دەڕژێ (...)

***

**ئەمشەو خەزان هەناسەی شمشاڵی شوانە(...)**

**دەرگای بورکانی خەفەی ڕۆح دەکاتەوە!**

**شەستە باران نمەی تواوەی گۆڕێکە**

**بەفری تەمەن دەشواتەوە**

**کەناری عەشق کەوتۆتە بەر لیزمەی مەرگ!**

**ئاو لە پێستی کلاوە بەڕوی خوێن دەردێنێ**

**پاساری ڕۆح لە سێڵاوگی ژەهراویەوە**

**زیبە ڕۆی نەخشەی مێژوی کەتوەتە ناود**

**ڕۆح و لاشە بەردو تەمی**

**پوش و ئەستێی**

**بۆشایی کۆتایی ئێستان**

**لە چاویلکەی رۆحێکی نامۆی وێڵەوە**

**دەڕِواننە پەڕەی سیناریۆی گشت عالەم!**

**درەخت بەسەر خۆڵا چاوی دەشوات!**

**ئاسمان کۆلارەی ریخۆڵەی ئەستێرەیە**

**شەو هەناسەی بوکی ئەشکەوتێکی تارە**

**کە کەژاوەی خۆری کوشتە دەستەی خۆی بێت (...)**

***

**ئەمشەو خۆڵ دەبارێتە خوارەوە!!**

**ئاو بە ئاسماندا هەڵدەپژێت!**

**کلاو ڕۆژنەی گۆڕی خەیاڵ**

**چاوێکی وشکی ناو خۆڵە!**

**خۆڵە پەتانێی ناو چاوی منداڵێکی تەریو بکات**

ئەمشەو پەنجەرەی ئەبەدی تەڵخ بوە
چاو هەڵدەفڕێت لەسەر گۆڕستانی مێشك!
دەستێکی رەش بینەقاقای منالآنی شاری گرتوە
پێغەمبەرێکیان سەر بڕی
خوا پەڵەی گریانی بۆ ڕشت!!
تەرمەکەی کەوتە دەریایەك
فرمێسك‌و خوێن خنکاندبوی!!
گەردون پەتی مەرگی لە ملایە ئێستاو ئێستا
مەرگ ژینەو ژیان مردن
خوێن ئاوەژوی ڕوبارێکە شەونم ڕێژە
شیلەی گوڵی کێڵگەی گۆڕستانی چاوە
پێکی هەناوی ئاسمانە
بێ خرۆکەی خۆشەویستی شەپۆل دەدات
گۆپکەی کوژاوەی نەمامی بەر گرێوەی گەردەلولە
ئەشك با ڕێژی چاوێکە
لە بارانی ڕەشە گۆشتا خامۆش بوە
هەتاو چەقۆی خۆ کوشتنی شاعیرێکە!
بەفر ماڵی سۆمای چاوی مندالآنە
دار بنێشتی خۆشەویستی پیا لچکاوە!
بۆ سێبەری لالەی بن بەردێکی تەنیا
تابلۆی خاکە دێمی حەسرەت رەنگی کردو
بەسەر شەوی پێستە قژا ئێشکی گێڕا!
***
ئەمشەو خۆر تابلۆی گۆڕیکە!

لە سەر نەخشەی بونا ون بو
سەرینی یاد پەڕی بایەقوشی شەوە!
لە کەللەیەك هەڵچەقیوە
لە گەڵ گەردەلولا ناسنامەی خۆی لێکەوتوە
دڵ سیغاری توتن کێشی دەشتاییی‌یە
رۆح هەناسەی پێکی ئەفسانەی مەلێکە
لەو دیو هێڵی کۆتاییا هەڵفڕیوە!
مێشك بزماری ناڵی ئەسپێکی سەر کەشە سمکۆڵ دەکا
ئەم جیهانە بێ دیوارو بێ پەردەیە
پەڕۆی بوکێنی لە بەردەم سواڵکەرا ڕاخراوە!!
قوڵایی چاو لەناویدا بزر بوە
شەش پاڵوی چاو نامۆی حەزە
وێنەی مەلێکی گەڕیدەی شەپۆلی خوێنی جەستەیە!
بەسەر رۆحی با بردوا هەڵدەنیشێ
گەردون لە ناو وێنەیەکدا دەتوێتەوە
هاژەی بای تێکەڵی هەورە (. . .)

***

ئەمشەو چرای رۆحی ئازار هەڵکراوە ( . . ن)
پەپولەی بیرەوەری تیا دەسوتێت!
دەروازەکانی ئەم شارە داخراون!!
تەلبەندی قژو کەللەو مۆرەغەیە
پەرەسێلکەی خەیاڵ دەڕواو
تەزوی هەوا دەمخاتە ناو گۆمی ئەشك
رۆح تێك دەشکێت (..)!!

ئەمشەو ئەم شارە تنۆکەی سەر پێلویەکی ژاکاوە
بە شەبەقی نەبینەوە قەتیس بوە
ئەمشەو ئەم شارە گولاّوی گۆڕستانێك پەخش دەکات
هەزاران ساڵە خامۆشە!!
گڕو نوری تیا تۆراوە
ڕۆژو شەو لێی قەدەغەیە!
ئەمشەو ئەستێلی کێمو خوێن چاوگەی ژینە
عاشقێك لە چاوی خۆرە تاوێك یاخی بوە
بەردی کەعبەی دڵ چوەتە سەر ئەشکەوتی هەورا!
دو دەستی نوێژ دابەستەی تەمێکی ونە
لە چاوەڕوانی قیبلەدا کەوتۆتە سەر هێلّنجی مەرگ
لەگەڵ لێزمەی یادەکانی نیوە شەودا
مۆمی مردن بە دیدەیا دادەگیرسێت (...)!!
***
ئەمشەو مارشی مردنی هەتاوە!!
زریانی چاو خێوەتی کفنی چرۆیە
دەریای فرمێسك گۆڕی گەلاّ
تابوتی چاو بە هەوری عەشقا دەگێڕێت!!
***
ئەمشەو دەزو ڕایەڵی جەستەیە
خەو سێبەری ناسنامەی پەروەردگارە
رۆح سپێدەی گرانییە
مێژو زەڕنەقوتەی مەرگە!
خۆر تفی سەگێکی برسی!

گەلاّی سفر شمشالّی رۆحی کۆتایە
کات لە ژێر چەترێکا وەستا
سوژدەی بۆ کابوسی خەو برد
ئەستێرەیەك لە خۆر هەلاّت گیانی دەرچو
مێژوی مردنی بزر بو!
ئەم چرکەیە ژیان پێکێکی ڕژاوە (..)
هەلّم دەکات بەسەر گیای دوراوی پارا
ئاسمان پێخەفی تەرمێکە!
هەوا تابوت!
زەوی کفنێکی زەرد باو
گەردون گۆڕێکی هەتایی (...)
***
ئەمشەو چەرخ و ڕۆح و ئاو تێکەلاّو بوە (...)
زەوی وێنەی کاژی مارێکی کۆس کەوتەیە
بە دیار هێلکەی خۆلاّویا ڕاکشابێت
دلّۆپە بارانی سەر مەمکی خۆر
بە بایەکی ئەبەدیەوە بێشکەی سروشت لالە دەکات!
لە چرکەی مردنی بایا
ئاورینگی خوێن گەردنی جیهانی پۆشی (...)
***
ئەمشەو شەراب ئەستێلّی زوخاوی رۆحە (...)
لە تاریکی شەوە زەنگا خوێن ڕێچکەی بەست
تەنیا تابوتێکی زیندو زەنگی لێدا
لە ناو پێخەفی گۆڕێکا

چاو هەتەری تەرمێکی بێسەرو شوێن بو
نەچاو هەڵهات!
نە گوێ سۆراخی نوزەی کرد
دەنگیش هانای خنکانێکی نەدایەوە
دەستو قاچو سەریش وەرین!
شەویش پرچی زۆردارێکی دادەهێنا
کەپری ئەزەل باوەشێنی روخسارێك بو
دەستێك نەبو مەشخەڵی ئەم عومرە تاڵە دا گیرسێنێ
با هەڵی کرد
پەنجەکانم لە دڵ چەقین
جەستەم بەسەر پەیکەرێکا توایەوە
هاژەی بای تێکەڵی هەورە
ئازیزەکەم هەتاوێك بو
هەوری بەری تیشکی دەگرت
ئەستێرەی بەر رەشەباو پەپولەی تۆراوی گوڵ بو
دارەکانی ژیان هەمو قژو کەزیەیان داڕنی
شیری  مەمکۆڵانی پژا!!
پێستیان گوری!
خۆڵەمێشی بو بە هەور
کەچی وشەی خۆشەویستی وەك لە تاڵی قژیەوە کشا
***
کورە هەنگی ڕەشە تاعون ژیانی گرت
ئازیزەکەم سوژدەی بۆ قیبەلەی عەشق هێنا
فەزای میشكو جەستە سوتا

داری ئەوێنی تیا ڕوا

***

ئازیزەکەم چەقۆی عەشق لاشەت دەسوێت
دڵت هەسانی هەناسەی فەزای عەشقە
کەزیەت داوی هەزارەها ڕۆحی ونە
خۆشەویستیت پلەی ئاسمانی حەوتەمە
شیلەی رۆحی خۆر دەتکێنێ
خوێن کەوتۆتە نێوان رۆحی منو تۆو ئەوەوە
گەر خوێنی مانگ نەڕژێتە خوار
تەزوی عەشقت لاشەم دەکاتە ماسی خۆڵ!
نەشتەرەکەت بشارەوە
کێلانی دڵ شەختەی گەردەلولی ڕۆحە!
نسارێکی پڕ لە نسێی نهێنییە
شاخو دەری ئاو ڕشێن کرد!
درەختو گیا توایەوە
مەلو مرۆڤ پوکانەوە!
زەوی بو بە فەرشی مێژو
ئاسمان تەڵخی تکە ئەشکی مێشکە سوە
هەوری خۆ کوشتنی نیوە شەوە!
پزوی زەوی کرایەوە
فریشتەکان بروسکەی دڵیان دەگەیاند
کوا گزنگی فیردۆسی عەشق؟
سێدارەی مەجنونی هەور لە خاکایە
ئازیزەکەم بچۆ بۆ پرسەی فەزای خۆر!!

***

ئەمشەو سەدای گریانێك دێت!!

وڕکی لە قوڕگی مەمکە خۆرەیەك گرتوە

دەنگی پشیلەیەك دەر دێت شیری سکی بەردێك دەمژێت!

گوڵیك ڕەگی خۆی ماچ دەکات بو بە سوتو

هەورێکی تەم بەدوای چەمێکا دەگەڕا

کەوتە دەریای خۆڵەمێشی ئێسقانەوە

مەمکێك لە لێویێك ترازا

دو چاوی گەشی داپۆشی

پێغەمبەرێك بەرماڵەکەی لیَ یاخی بو

قاچی کرا بە کەللە سەر (..) !!

***

ئازیزەکەم (...) شەو ئاگری ناڵێکی سەر بەردەلانە

شانۆی حەشری کۆتاییە

کە خۆر پێش مێژو کوژرابێت!

نوزەی خەفەی منداڵێکە

لە کفنی دایکیا نێژرابێت

بەنەخوێنی ئەم شەوە قەت ناکرێتەوە

من تەنیام و هۆشم ئیسپرتۆی چرایە

لە بەر پەیمانی گۆڕە شاری هەزارەها مەشکەی مەمك و

شیرە خۆرەی کلاو ڕۆژنەی ناو سکەوە

نینۆکی ئاسن گەردنم ڕننە دەکات

کوانیَ دەستت؟

کوانیَ پێکی ئەو شەرابەی تینوێتی ئەم شارە دەشکێنیَ؟

كوا تكەی رۆحی عەشق؟!
شارە مێرو بە جەستەمدا رێچکە دەکات
کەوتومەتە ژێر چەتری شاری کۆتاوە
خەو لە دەزوی چاوەکانمەوە پچڕاوە
گوێزان پێستم هەڵدەدڕێت
خوێنم پەپولەی فەزایەکە بەخرۆکەی تۆ دەسوڕێت
شەو درەنگەو تارمایی مەرگ لە دەم ئاسۆوە والآیە
کوا ئاوێنەی چاوی عەشقێکی ئەبەدی؟
دڵ زرنگەی زەنگی ونی کەنیسەیە!
رەمزی تازەی لە خاچ دانی مەسیحێکە
سەد هەزار ساڵ بەر لە مەسیح گیانی داوەو
دو ئەوەندەش لە دوای ئێستا چاو هەڵدێنێ (...)
***
ئەمشەو جەژنی لە دایك بونی مەسیحە (...)
خۆی‌و موریدی چاخێکی لە دار دران
ئەمشەو سروتی چرکەیەکی کۆنی مێژوە
چاو خەرمانەی هەزاران گەلآی مەجنونە !
لە بەر برژانگی چاوێکا کوتراونەوە
خەنجەر لە ئێسکا خەوتوە
با گڕوگاڵی خستوەتە سەر لێوی تورەی
تیشك بەسەر بالآی خۆیا دادەچەمێت!
خوێن سەر خەوی پێدەشکێنێت!
لە پرۆڤەی خوێن گەوزانا دەتلێمەوە
هەتا چاوێکی تۆ هەڵدێت (...)

لەم شارەدا نیگا بەر نیگا ناکەوێت!
چاو هەڵماقۆی یاری بەختی بایەقوشە
تەمەن لەبەردەم هەناسەیەکی ئاسندا بزر دەبێت!
ئازیزەکەم (...) گیان لە مستا فرتە دەکات!
ئەو ڕۆژانەی بەدوای دڵما بوم بەڕێبوار
لە ژێر پۆستالێکی ڕەشدا چرۆی دەرکرد!!
***
ئەمشەو قامچی لەسەر پێستا نوقم بوە (...)
ژوانی دۆژەو یادی عەشقێکی کۆتایی پێستم دەگرون
جەستە زەوی پشکۆی خاچێکی دێرینە
بۆ درەختی لوتکەی خەیاڵ چاو دەگێرێت
لە شارێکا کۆتر بە فەزادا دەفرێت
تابوت بەژێر باڵی بایا جەستە دەبرێت
ڕۆح بەفەزای ئاسماندا پەرش کرا
تەنیا شێیە
بوکە بارانەی ساوایەکی شیلاوگە
لەیەکەم کێڵگەی تۆوەوە چرۆ دەکات!
زمانی جەستەی یەکەم چەرخ دێنێتە گۆ
چاوشارکێی گەردونە تواوەکان
مێژوی جیهانێکی سفرە!
تەنیا شانۆی شەڕی هابیل و قابیلە
کێڵگەی زامی ئێستاو زەمەن خوێن جمانی نەشتەرێکە
ئێستاش دەواری ڕەشی ئەم شارە زمانێکە
بەسەر ڕەگی دارێکەوە کەف هەڵدەسوێت

ئالاّ نرخی پەڕۆیەکی بوکی نییە!
مرۆڤ کەفی دەریای خوێنە
زەوی دۆژەی فرمێسکەکانی ناو چاوە!
عەشق چەردەی قەرەچییەکی بێ نەژادە!
لەم شارەدا شەو ڕۆژ دەکوژێت!
ڕۆژ خۆی دەکاتە قەرەبروت!!
شەختە لەناو پێڵوی گڕا چاو لێك دەنێت (...)
***
ئەمشەو فلمێکی تازە لەسەر ڤیدیۆی ژانەکانما کەوتۆتە ئیش!!
خوێنم مەیبی خەرمانەی ساتە وەختێکە
ئاسمان گوێزانێکی بە سکا دێت!!
گۆڕ بۆ بونێك هەڵدەکەنێت!
کۆشکی فەزای بونێکی تر دروست دەکات (...)!!
***
ئازیزەکەم چاو هەڵهێنە (...)
بڕوانە شار پڕە لە دەریاچەی باروت
بۆتە پوشو
شەو ژەهراوی سەبیلێکی یەك ژەمییە
خۆر دوکەڵی سەر لێوێکی داڕزیوە
مێژو ئەستێرەی کشاوە
ئەوا دەمرم نیگات شەق کە
با تەمو مژی ئەم نیوە شەوە تاریکە
لەسەر سۆمای چاوەکانتا بکوژێتەوە
پێلو لەسەر دیدەت لابە با چەقۆی مێشك بترازێت

پەتی سێدارەی عەشق بخەمە مل
لە تابوتی هەوری وێڵا جارێکی تر
گەشتی کا کێشانی مەرگ
نامەی عەشقێکی هەتایت بۆ بنوسن
ئازیزەکەم لەو ساتەوە خۆر گیراوە!
چاو شارکێی شانۆی ونی هۆمیرۆس‌و خۆر و من‌و تۆیە
نیگاکانت بخەرە سەر جەستەی من‌و
ڕو لە چرای کۆشکی خوا کە (...)
***
ئازیزەکەم (...) نەشتەر پرچی ئافرەتێك دەدۆزێت (...)
با پۆپەشمینی خەویەتی
ئاسمان هێمای ون بونی تاریکە شەوە
زەوی ڕەمزی کەوتنە خوارەوەی عالەمە(1)
دەریا وێنەی پێکە ڕۆحێکی فرۆیە
لەسەر گۆی مەمێکی شەختە لێو ماچ دەکات
ئازیزەکەم (...) ئەمشەو جەژنی ڕزگاریە
جەستە لە بەندیخانەی پێستا ئازاد بوە
خوێن سپی‌یە!
ئێسك سورە!
سروشت تەرمی دو تابوتی سەرو بنە
نەشتەرەکەت بخەرە ناو کێلانی دڵ
نەبا بمرم (...)
***
ئازیزەکەم (...) ئەمشەو تیشك لەناو تونا خامۆش بوە (...)

گرێك نی‌یه چرای دڵ دابگیرسێنیت!
مانگ بوەتە تۆپێکی یاری
جەستە لە کێڵگەی خنکانا شەتڵ بوە
نەشتەرەکەت بخەرە ناو تابوتی چاو
لە ژێر دەوەنی کەزیەتا حەشاری دە
لەودیو چیای خۆرا دەست بە پەلکە زێڕینەوە دەگرین
بەسەر تەرمی زیندومانا ئەشك دەڕژین
نەشتەرەکەت لە هەسانی ڕۆحم هەڵسو
دڵ تابوتی گیان کێشانە
با بورکانی رۆحی خەفە ئاگر نەگرێت
***
ئێستا چاوەڕوانی کات ژمێری نیوە شەوە
هەڵدەکورمێم بۆ چاوێکی برینی عەشق
چرکە دەڕوات وێنەی پێکی عاشقی کێو
تەمی ئازاری  دوا چرکە دام دەپۆشێت
چاوەڕوانی پەردە هەتاوی شەونمە
تاتە شۆری لە دایك بون گۆپکە دەگرێت!
چاوەڕوانی میلی چرکەی پێش تەمەنە
لەم ساتەدا دڵ بۆشایی زەنگی مردنی نامۆیە!
مێژوی شاخی ئاسکیمۆی سارایە
گزنگی لێو لە پاڵ هەورێکی رەشدایە
هیچ دڵۆپەیەکیش نابارێت
زەویش بەرگی مەرگی ئێستاو بونی لەبەردایە
***

ئەمشەو چرا کەوتۆتە بەر هەناسەی خواو (...)
خونچەی ئازیز لە تابوتی دڵ تۆراوە
وێنەیەکە لەوای بون و پێش بونەوە زەین دەبڕێت
ئیێستا پەپولەم و گوڵی ئازیز ناژاکێنم
وەرە ئازیز جەرگم بدڕە
با لە گومان ڕزگارم بێت

***

ئێستا گڤەی هەرەس هێنانی ژیانە
چرکە مۆڵی پیرۆزەیەکی سوتاوە!
ئەو شەوانەی پێکی مردن لێوان دەبو
لەبەر تکەی زامی رۆح و ئەشکی نەبینی چاوە سو!
کەف دەچڕایە سەر شوشەی ئەڵماسی دەریا
ئێستا وێنەی کۆچی دوایی دەبینمەوە!
گۆڕو بێشکە تەلیسمی جۆماڵینی کۆتاییە
شیرو ژەهر تێکەڵاوە
هاژەی کەوتنە خوارەوەی روخسارە
وێنە لە ناوخۆیدا دادەبڕێت
چڵە گیای گۆڕ پرژە دەگرێتە تابلۆی دڵ
لەم ساتەدا هەوای ژێر خاك ئاوێتەیە
سکی زەوی تاتە شۆرە
قەد ئێسکێکی داڕزیوە
درەخت قژی هەتاو شانە دەکات
وێنەی بونیش دەخاتە ناو گۆڕی مێشك!
ئازیزەکەم کوا سێبەری تێزاباویت؟

سیمات تەمی دۆژەی دەرونی وێنەیە
بم سوتێنە نەبا  بچمە کۆشی گۆڕی زەویەوە (...)
***
ئەمشەو گەلا ئاهەنگیانە یاری لەسەر بەختم دەکەن (...)
گەلای ئەستێرەی سەر تەرمم ئاسمانێکە
هەور وێنەی قەدەغەییم دەداتەوە!
هەوا ناوم بە گوێی جیهاندا دەچرێنێت
ئازیزەکەم کوا چەقۆکەت؟
سەرم ببڕەو لە توێی پێلوتا بمنێژە (...)
***
ئەمشەو شەماڵ نەشتەری ماڵئاواییە (...)
گەلا کەزییەی درەختی گیان هەڵکێشانە
لەسەر بەردو پوش و ئاوا وێنەی ئێستام دەسڕنەوە
لەم ساتەدا وێنەم تەنیا تابلۆی مەرگە
لەجیهانێکی سوتاوا وێنەم نەما
هەواو زریان و خۆڵ و تەم و هەورو ئاسمان
دەریاو کەف و تاڤگەو سەهۆڵ ناومیان رفاند!
مێشکم بەسەر خۆڵی جەستەیا هەرەسی برد
تەنیا وێنەم لەناو دیدەی تۆدا ماوە (...)
***
ئازیزەکەم رێگا تۆفانی شەوماڵینی کەوتۆتە سەر (...)
کاروان کوژە بۆتە سەرابی سپێدە
گزنگ شمشێری خۆخواردنەوەی تاریکی یە
سەدان ساڵە گشت چرکەیەك من دەکوژێت و

فریشتەی عەشق تاوانێکت بۆ دەنوسن!
سەدان ساڵە لەدەرگای خوای عەشق یاخیت!
ئێستا بومەتە هەزاران ئەستێرەی ناو گەردونی کوشتارتەوە
منت کوشتو لەناو تەمی ئاهەکانتا لەدایك بوم
ئێستا تکەی مردنو ژینی ئەڤێنتم
وەرە ئازیز لە کاروانی دۆژەو فیردۆس رزگارم کە
تکەی یاقوتی تەنیایی شەو بەملتەوە ژەنگی هەڵگرت
نەشتەرەکەت بدە لەدڵ با خوێنەکەت سنگم بشوات (...)
***
ئەمشەو ئاڵتون لەگەردودا دەتوێتەوە!
قوڕاو جەستە سیواخ دەدات
لەشکرە هەنگ بەهەناسەی خوێنی سیا داباریوە
لە شادەماری گیانەوە تەرە دەبێت
دەرون سەهۆڵ بەندانی تۆفانە
دڵ لەشەمەندەفەری کفنا سەفەری کرد
کاژێری ژێر بەردی مێژو کەوتە چرکە!
لەسفرەوە قفڵ درا
لەم ساتەدا ژیان کلۆی بەفری چاوێکی نوستوە
سەرسەڕ بەناو رۆحا گڤەیەتی
شەو تلیاکی لەبیرچونەوەی ئێستایە
کات حەشیشەی گەڕانەوەی رابردوە
گەردون تکەی داهاتوە بۆ سەرەتا
ئەم چرکەیە ئێستا جەللادی مێژوە
ئازیزەکەم خوێن شەونمی تاڵی قژتە

له قەنارەی زوڵفەکانتا بمشارەوە!
نەوەك تەوری (ئێستا) سەرم ببڕێت
موەکانت لەگەردنم بئاڵێنە!
هەتا ببمە گۆڕستانی ڕۆحت
بەخرۆشی خوێناوەکەت لەدایك بم
ببمە کاتژمێری جەستەت (...)
***
ئەمشەو گەردون پزوی دەرپێی چۆلەکەیە (...)!
هێلکە تابوتی جەستەیە
گۆڕ بێشکەی لەدایك بونە!!
ژیان بیرۆکەی داپۆشینی فەزای جیهان
داری گەردون بەدەم پێکی کۆتاییەوە لەرز گرتی
پەلکە زێڕینەی هەتایی کشایە خوار
ئازیزەکەم میوانی ئەشکەوتی دڵتم
نەوەك گەڵای تەمەن دابوەشێت
ببمە تەرمی نیگاکانت
نەشتەرەکەت لەخوێناوا بشارەوە
تا ئاورینگی ئەوێن دەڕژێ
بەسرودی چاوێکەوە وێنەی عەشق لەچاوانتا ببینمەوە!
ئەوسا لەناو وێنەی یەکتریدا دەتوێینەوە (...)
***
ئەمشەو زەمەن بازنەیەکی داخراوە!!
روانین سەرابی ژێر هەورە
بەسەر دەفتەری مێژودا لێزمە دەکات!

کەشتی ژیان لەشەختەیا نوقم بوە
کوانێ کەعبەی نیگای جوانیت؟!
ئازیزەکەم دەواری خۆت پێچایەوە
سەهۆڵ بەندانی ئەم شەوەم لەسەر لابەیت
کوانێ بسکت بمخنکێنە؟
لە جۆلانەی رۆشنایتا یاری بەدەستەزە دەکەم
بم لاوێنەو گڕوگاڵم بخە سەردەم
نەوەك گیانم بێتە دەرو شوشەی کۆشکەکەت تێك بشکێ؟! (...)

***

ئەمشەو زستان تاتە شۆرێکی گیاندارە
هاوین جەستەی زامدارێکی تاریکییە
بەهار نەغمەی خوێن چڕانە
پایز سێدارەی زمانە
ساڵ گۆڕستان!
زەمەن شاردنەوەی وێنەی بون!
هەوا گوللەی ناشتنی پەپولەی ئەڤێن!
ئازیزەکەم من مێش هەنگم
دەمرمو تەرمم وێنەی چاوانتە!
بەلێزمە شەونمی عەشق هەڵڕێژە
با لەچاوەکانتا بمرم!
رو لەم بونە بشارمەوەو لەخوێنەکەتا زیندو بم (...)

***

ئەمشەو هەوا سەما کەرە (...)
هێشوی ئەستێرە لەزەوی بەر ئەبنەوە

زەوی لە ئاسمان دەترازێ
رۆژ دەچێتە جوگرافیای مانگ
مانگ هەزار میل هەڵدەکشێت
خۆر دەکەوێتە خوارەوە
دەریا لە زەوی دادەبڕێت
عالەم لەهەڵما رێدەکات
هەڵم دەبێتە قژی مانگ
وێنەی تاریك دێتە دەرێ
من رێبواری بەستەڵۆکی شەوارەی ئازیزەکەمم
کەوتومەتە دورگەی بەیار!
نسێی هەڵم نوقمم دەکاو
تەزوی ئازیز رامدەکێشێ
شەستە لەچاوا سپییە
گۆچان مۆمدانی گیان دەرچون!
ئازیزەکەم کۆلارەیە
لەودیو بونا کەوتۆتە ژێر خێمەی رۆحم
بۆ وچانێك دەچمە ژێر پاسارگەی خوێنی
هەتا جەنگی ئەم گەردونە کۆتایی دێت (...)

1992/1/1 **سلێمانی**

---

(1) رۆلانبارت دەڵێ: وشە کەوتنەخوارەوەی جیهانە. ئەم قەسیدەیە پێشکەشە بەو (کەسێك کەفێری کێشانی تلیاکی وشەی کردم فێری کردم کەچۆن گومانو پرسیار بەکێشانی تلیاکی وشەوە بەرجەستە بکەم)

# سێ نیشتمان

شەوە زەنگە (...) شاری نیشتمانی دڵ داپۆشراوە
خوێن تەریبی بستەخۆڵێکی دەم بایە!
ڕۆح لەسەر لوتکە هەڵدەفڕێت
جەستە ئەسیری نیشتمانی دڵداریە
عەشق کۆیلەی گریانی بێ پەساپۆرتە
چەرخی گەردون ڕەنگی خوێنێکی سوتاوە!
ئاسمان وێنەی لانکەیەکی گۆڕنەخشە
لەگەڵ زرنگەی مردنو پەڵە ئەسرینی کۆتایی
سارای زریانی تابوتی وێڵ
کاتژمێری ئەڤێن دەخاتە سەر چرکە
مەلی خەیاڵ هەڵدەفڕێت
ئەم نیشتمانە جێ دێڵێت (...)

***

شەوەزەنگە (...) منو نیشتمانو خوای عەشق
لەبەر هێشوی تابوتی فەزایا ون بوین
دەریا چیای ئاوی بونە!
من نیشتمانی ئەوێنم
ئەوێن نیشتمانی ئەو و ئێوە و تۆیە
شەوەزەنگە (...) شنەی بای وەشت

پەشتە ماڵی جەستە سەر بڕاوەکانی دارستانە
لە نیوەشەوی دێجورا
پەلکە زێڕینەی بارانی خوێن هەناسە هەڵدەمژێت!
پەڕی گوڵ لەناو شیری مەما ژاکا
زەنگی کاروانی دڵداری زریانی ڕۆح
گوڵ دەخاتە بەر ئەشکی با!
هەور بەدوای پەڵە باراندا وێڵ بوە
ئاسمان گۆرستانی جەستەی ئاوە
ئەمشەو ڕۆحی ئەم وڵاتە کۆچەرىیە لەدوندی مەرگ
ئەمشەو پزوی هەوری ئاوارەیی پسا
زمان کفنی لالەو خونچەی لالەسارە
تابوتی تەرمی عالەمە!
وشە گۆڕی شوشەی زمانی کەلەپوری نیشتمانە
ئەمشەو زمان بو بە  گۆڕستانی کۆمەڵ
وشە نەشتەری خۆ کوشتن
هەوری خوێنینی حەرف هات
منو وعەشقو نیشتمانو دڵی پۆشی (...)
***
شەوە زەنگە (...) خوێن پەرچەمی هەیکەلی بون
دڵ ئەستێرەی  کشاوی شەو
دەنگ مەقامی سەر لێوی شوانێکی سارا
پەڕی داڵی ئاسمانی سور کردوە
ئەمشەو تاریکی ساماڵی شەختەی چیا
تەرزە زمانی عاشقی تیادا ڕنی!

من لە سیبریای ئەوێنی نیشتماندا ڕەق بومەوە!!
لە پەرچەمی ئافرەتێکی کێویلەدا لە دایك بوم
***
شەوە زەنگە (...)نەمام لە توێی پێخەفی چاوا گیانیدا
چاو ڕۆشنایی داری یاقوتی گریانە
فرمێسك سۆمای کفنی هەتاو
مۆمی ڕۆحی نسیێ سیا
تونێلی عومر لەژێر ئەشکی گەڵای شەوا گڕکانی گرت
ئەمشەو خەزان شوشەی فەرحانی تەمەنە
با ڕێزە هەوری خوێناوی کاتژمێر
لەم ساتەدا تەمەن هەناسەی باڵدارە
ئاسمان کەشەی سیناریۆی عالەمە
مێژو مەمەی سۆزانیە
ژیان تکە یاقوتی ژەنگاوی
زەمەن گڕی گەڵاجاڕی پەپولەی گوڵ
ئەمشەو ئازیز بو بە هەور!
تەمی تەنیایی مردنم دەگاتە بەر کۆشکی خواو
زەنگ بە گوێچکەی مەلی گەردوندا دەهێنێت!
ئەمشەو هەناسە سامناکە
زەنگی کۆتایی ئەشکی یاقوتی هەتاییە!
ئەمشەو وێنەی مردنی عالەمێکی بێ ناسنامەم کەوتە بەرچاو
نیشتمانم
عەشقم
دڵۆپی ئەو فرمێسکانەم کە خوا بۆ بێکەسی ڕشتی!!

***

**ئەمشەو لۆکە چنی شەوی تەنیایی عاشقە**

**نیشتمانی کێوی توری هەناسەیەکی سوتاوە**

**ئەشکی هەزاران مەسیحی ڕژایە سەر**

**ئەمشەو جەستەم نیشتمانی گڕو بۆسۆو قەرەبروتە**

**خاکی تەلەێکس‌و گڕ سەندن**

**هەزاران چاو لەدیدەما یاری دەکەن**

**ملوێنان دەست لەناو دڵا ڕاکشاوە**

**سەدان بورکانی ژێر هەور ناڵە دەکات!**

**ئێستا برینی دڵداریم**

**من عاشقم جەستەم نیشتمانی خاکە**

**مێژوم سفرە**

**یاری تەنیایی شاڵاوی دڵ سەما دەکات!**

**زمان مێژو جیهان**

**سێ کوچکەی زەوی بێ جەستە**

**من بومەتە جەستەی عەشق**

**عەشق جەستەی من‌و فەزاو ئەوە**

**ڕۆح‌و خوێنی ڕژاوی نیشتمان سێدارەی جەستەو تەمەنە**

***

**شەوە زەنگە (...) زریان دۆژەی گریانی ڕێی نیوە شەوە**

**بێشکەی بونێکی هەتایی**

**ئەمشەو گیانم هاتۆتە دەر**

**عەشق جەستەو بونی داپۆشیوە**

**من ئێستاکە مەلی سەربازێکی ونم**

له نیشتمانی عەشقا کۆچەری
کۆچم نیشتمانی عەشقە
عەشق نیشتمانی منە
من مۆسیقای خوای خۆشەویستی ئەم شارەم
***

شەوە زەنگە (...) هەوار پۆپە شمینی شیوەنی لە کۆڵ ناوە
تیشك بەسەر باڵای لالەیا دەڕێژێت
شەوەزەنگە (...) تارمایی بەر بوکی شەوە
دەستی لەسەر دڵی کاتژمێری خوێنا وشکە
چیا دەستی خەناویە
بە دەمامکی هەوری سواو کرا بە تەم
ئێستا دەسماڵی کەشەی کوشتارە!
چاوی شەفەق لە ژێر بەرداشی شەوایە
پێلو لە ئەشکەوتی گۆشتا وەری
سەرما وەرزی چلەی تەمەن کێڵگەی برژانگ
پەرژینی ژوانی سارای کرێوەی گیان چونە!
نیوەشەوە هەورازی عەشق بە هەوری چاو کوژایەوە
چاویلکەی عەشق نوقمی ژەهراو
بەسەر پشکۆی دڵیدامرکاوا هەڵدێت!
نیوەشەوە پەیکەری تاریکی جەنگەڵ دەستو قاچە
هەزاران جەستەی وەرینی کۆشی بایە
زەرادەشت لە دۆژەی خوێنا ملی قرتا!
مەسیح بە گیانی پەپولە سوتا!
نێوەشەوە (...) ئاسمان خوێنە!

شەوەزەنگ چیای مردنی با
بێژنگی هەناسەی جەستەی درەخت
خوێناوی لالە دەتکێنێت!
ئەمشەو مورو لە داری ئەبەدیا کەوتە زەنگۆڵ
هەوا نەشئەی سەمای مردنی نامۆیە
مانگ لە زمانی ئەڤێنەوە کشایەوە خوار
وێنەی جیهان تاڵیشکی بو
بەشەوارەی  دەشتی حەشری پرۆڤەوە
هەزاران داڵ بەری ئاسمانیان شاردەوە!
ئەمشەو جەستەی درەختی گریان بو
هەنسك وێڵی قوڕگێکی سوتاوی خۆڵ بو
گەرو بۆ جەستەیەك گەڕا
جەستە بۆ  گیانێك  کەوتە ڕێ
ڕۆح بەدوای گەردوندا سەوڵی لێدا
گەردون زەنگی کۆتایی کەوتە زەنگۆڵ!!
***
شەوەزەنگە (...) تاڵی قژی چیا ئالاوەتە گەردنی هەور
هەور چاو بە مەرگەسات دەڕێژێ!
درەخت کۆرپەی هەناسە شەختەی شەوە زەنگ
گەلا لە سکی بایا هەڵدەکشێت
ئەمشەو خونچەی تەرمی گۆرستانی ئەشکە!
ئێسك لە ناو خوێندا چاو هەڵدێنێت
ئەمشەو پەرچەمی تاریکی ئەشکەوتە شێی بینایییە
من بێ عاشق و بێ وێنەو سرودی دڵداریم

عاشقی چیای دارستانی دڵم
ئازیزەکەم پەڕی گەڵای ڕا ڕفیوە
فیردۆس عەشق لالەزای حەشارمانە
ئەمشەو ئازیز تاڵیشکی خۆرێکی ونە سبەی هەڵدێت
پەساپۆرتی خۆشەویستیم لیَ ون بوە
ئازیز وێنەی بریسکە نیگای ئەبەدیە
دلَ و مێشك و هەناو و چاو بریسکەیە
پڕە لە وێنەی روخساری ئاوا نەبون
هەمو ڕۆژێ پەیکەری نویَ لە ناو دڵما پەخش ئەکات
وێنەی نەمر کەوتۆتە خوێن
لەلەشکری عەشقی کۆتایی ئەسیرم!

***

شەوە زەنگە (...) ئەمشەو بنار پێدەشتی مەرگەساتە
فەزای ئاسمان سوراو دەکات
کێو و چیا سکیان ئاوسی کوشتارە!
چەمو دەریا منداڵی تاوانیان لیَ بو
پەنجە تەرم دەخاتە خوار
پێست تابوتی رۆحی کوژاوەی دەم بایە
ئەمشەو ئازیز چاوی خەڵوزدانی مەرگە
مانگ و رۆژ و ئاسمان تۆران
کەشتی ئۆقیانوسی تەرمی سپی راخەرمە
ئازیز ون بو(...) نیگای لەسەر رۆحم هەڵکراوە!

***

شەوە زەنگە (...) خەزان دەسماڵی شەوگاری بوکێنییە

ئەمشەو عارەق بەخت گرەوەی جیهانە
فاڵچی مێژو لەسەر مێزە
ئەمشەو منو خۆشەویستیو نیشتمان وێنەی پێشهاتی ژیانین
کاغەزی جۆکەری مێزی شەوگار
رەشەبا دێت منو خونچەی  خۆشەویستی دەوەرێنێ
***
ئەمشەو نیشتمانی عەشق بروسکەیە
کێڵگەی بەر تاوە تەرزەی تاوانە
ئەمشەو من لە بازنەی مەرگی بێ کۆتایدا
دەفڕم بۆ لوتکەی دڵداری
ئازیز قامچی نیوەشەوی ئازاری ڕۆژی کۆتایم
من مردنم وگۆڕی جەستەم کەوتۆتە بەر شمشێری عەشق
ئازیزەکەم لە کا کێشان کشایە خوار
دەچمە شارستانی چاوی
بە دەریای خوێنیا دەگەڕێم
ئاڵای عەشقی ئەم جیهانە دەگرمە دەست
***
شەوە زەنگە (...) تریفەی شەو سەر بڕاوە!
خوێنی سپی بنیشتی لالەی دارستانە
ئەمشەو خوێن لە دەماردا وشك هەڵهات
نەشتەر لە جەستەی خۆڵا  نوقم بوە
قورسایی با تۆزی ئێسکی داڕزیوە!
ئەمشەو تاریکی ئاوێنەی عالەمێکە
بە نەفەسی داڵێکەوە خەفە کرا!

***

شەوە زەنگە(...) تەمو مژی برینی جەستەی بێ خوێنە
کانیاو بۆ کۆشکی خوای ئەڤێن دروست دەکات
چرکە سارای خۆڵە پەتانێی شیلاوگ لە ئاسمانەوە نەخشاوە
ئەستێرەی بەخت بە خوێنی قاچو کەللە سیواخ بوە
ئەمشەو ئاسمان مێزی تێنسی جەستەو گیانە
مەمکی ئەستێرە پوکایەوە!
تیشكو چڵمو شیرو خوێن تێکەڵ بوە
زامی عەشقی ئەستێرەی شەوگار لە  خەراری بارەشدایە
خۆر لە چەرخی خۆی ترازا
مانگ هەناسەی بە زەریای خوێناو تێکەڵ کرد
ئەمشەو منو ئازیزو نیشتمان ئەسیر کراین
من پارچەیەکی ئاوارە
ئازیز ئەستێرەیەکی کشاو
نیشتمانماڵێکی سوتاو
عەشق دۆژەی نیشتمانی لێکدابڕان
ئەمشەو جیهان ترازاوە!
منو خۆشەویستی و نیشتمان چوینە سەر کۆچ
سێ پارچەی ون بە گەردوندا دەخولێینەوە
لە ژێر درەختی گزنگی زەمەنی سفر بەیەك دەگەین

***

ئەمشەو نیشتمان کۆتری خەیاڵی ڕوانینە
ئۆقیانوسی مردن بەندیخانەی تاریکییە
ئەمشەو نیشتمان گیان کێشانی سپێدەیە

شەوەزەنگ تاریکی لـێ تۆراوە
ئەمشەو من لە ئازیز ون بوم
ئەویش دەستی خۆشەویستی کەوتە بەر هەور
ئازیز کاتژمێری خۆری هەتایی تەمەنە
ئەمشەو شەوەزەنگ پێستی جەستەمە
نە ئازیز دێ؟!
نە تیشکی هەتاو دەکشێت؟!
نیشتمانیش کەوتە سەر کۆچ
ئازیز لە نیشتمانی خوایا بزر بوە
من لە نیشتمانی عەشقی وێڵا
نیشتمانیش سەرگەردانی منو خۆشەویستیو ئەوە
سێ نیشتمان شەیدای یەکگرتنەوەی خوێنە
منو نیشتمانو عەشقو ئازیز
سێ نیشتمان دەگەینە یەك
سێ نیشتمان فرۆی درەختی دڵداری
سێ نیشتمان (...)سێ نیشتمان (...)سێ نیشتمان (...)

99/3/4

کتێبخانەئەوقاف

# گەردیلەی گیان

چەقۆی تاریکی بەر پیلوی گزنگ
باڵی سیستەمی کێشاوەتە سەر جەستەی لۆکەیی
تەزوی کارەبا زەوی گرتوە
هەڵماقۆی مەرگە دەواری ئاسمان
تاڵیشکی تەزوی مەرگەساتی نوێی کرژ بوەتەوە
بە زەنگی پیانۆی سروشتی بێ ئاو
شیشەی حەوت چینە تەڵخو خوێناویە
هەر لە مردنی دایکە حەواوە سکی شیلاوگی ئاوێنە زێرە
هەتا دوا ساوای خوێن گرتوی تازە
تابلۆ مۆمدانی ئاوێنە وەرزی فۆتۆی سەرە مەرگ
بروسکە گیانی ناو مەڵۆی شاراوە
ڕچەی شەوارەی پەردەی کوللە کوژ قژی واڵا بو
بەسەر سروشتدا ویسامی خۆری کەوتۆتە سەر شان
بۆ کارەساتی هەورە سورەی بون
تکە دڵۆپەی دەفتەری ناو گۆڕ
خومخانە شۆری شەوی گوڵە جۆ
گەردونی مەلۆتکە وردەی گەردەلول
گڵمتەخۆڵی زێڕە تواوەی سەر هێڵی سفرە
بە دوجا ڕێگای مردنو ژیندا هەتاویان دۆزی

سەگ وەڕی لوتکەی لۆکە چنی جەستە
چەخماخەی شاخی داچوی شاردەوە
بەفر لەبسکی خۆرەوە چلورەی گرت
شاری دڵ نیشتمانی ئاسکیمۆی کۆتایی بو
سێبەری نەخشە کۆنەکانی رۆح
کەپری ئەزەلیان لە سەر هەڵبەست
جیهان بە باڵی مەڵێك داپۆشرا
پەڕ هەمو دەنگێکی خنکاند
پزوی درەختوگیا رەنگی توریان گرت
سپێدەی سەدە تەڵخ بوی ئاورینگ
مەشخەڵی عومرم چوە ناو گەڵای وەیلەوە
دێڵە سەگ شەپقەی سەرۆکی جیهان
گوڵ تاجە زێرینی دارنێ تەمەن
توتك پۆشاکی ئەفسانەیی خۆر
بەسەر زەویا کەوتنە هەلوکێن
شوققەی حەوت چین
تکەعا رەقەی ژێر قامچی پزاند
شوشە نیگار زێڕ
هێلکە خەواڵوی مەرگی ترەکی
ئەستێرە قەدیان بە گیان چون بڕی
گەردون کەوتە ناو قوڕی حەواوە
تیشکی وەرزێکی خستە بەر گاسن
هۆمیرۆس ئاوی دەریای خۆڵە مێش
رۆژهەڵات دوندە خۆرئاوای دوایی

باشور بۆ باكور
ئاسمان سك زەوی
زەوی بارانە نمەی تواوە
باران دەزولەی خوێنی خەوی منداڵی
ئەستێرە كوچكە پەیكەری مۆمیا
ئاسمان تەنراوی تێكەڵەی باروت
درەختو دەوەن لە رەگ هاتنە دەر
لقیان دەترژا بە كۆشی هەورا
گۆڕی ئادەمو موساو ئیبراهیم هاتنە دەرەوە
مردوی سەد سەدە بە تاتە شۆری نەو بوكی نوێوە
چونەوە ناو گۆڕ
ئاوێنە بروسكەی هەتاوی سەراب
مۆمە تواوەی ژێر دڵۆپە كێم
هەوا لەرزە رۆح
قەوزە رەنگی جیهانی بزر
دڵۆپە هەوری ناو سكی گەردون
پرۆڤەی هەوا پێشهاتی سەد چەرخ
هەنگ لەشكری كلافەی رێسراوی ئەستێرەی عەشق
بلیاردێك مردو چاوشاركێ سەراب
سەربازی زریان بە باڵە فڕەی كەشتی قەلە رەش
ترومپای شیلە هەڵی مژیەوە
لا رێی كۆتایی دار تابوتێكی شڕی بێجەستە
بوكە شوشەی خێو قاچی خستە سەر
ئێسكی زەرنەقوتە بو بە خەونی پایزە هەناسە

ئاگری خەرمانە بو بە سەربازگای جەنگی جیهانی
پۆل پۆلەو بلیارد دەچونەپاساری دۆزەخ
هەتا تەلبەندی ئەم ساتە چاو بە هەڵبڕین خامۆش دەبو
ئەشك لەگەڵ كەوتنە خوارەوەیدا دەمرد
لەم ساتەوە تەمەن لە قوڕاوی بێ مێژویی هەڵكشا
فوی شەیتانۆكە چاویلكەی میژوی لە هەویر وەردا
ئاسمان تكە بارانەی نهێنی گەردون
زەوی ئەڵقە ڕێز
هەور گڕ پوشو
چلورە ژەنەراڵ تەڵزمی نیگای ئابریشمە ئاڵتون
تەرمی نەهەنگیش شەختە پروشە
یونس مەچەكی ختسەوە سەر سنگ
بۆ سرودی خوا
شیلەی خۆر تكا
بەرماڵی عیسا شڕو شیتاڵ بو
بوكی زێڕنەخشە پرچی ئاوریشمی خستەوە بەر با
بۆمبێك گوڵدانی بلیاردێك گیانی تابوتی زەوی
شقارتە خوێنی گەردونی گوشی
باوە خولێی نێو گڕكانی ئەتۆم
دڵۆپە بارانی تەنورە سكڵ
جیهان كەوتە ناو هاوكێشەی مەریخ
ئێسك تاقیگای بیردۆزی زانست
گا بەردو گڕو بروسكەو سەهۆڵ
تاشە پشكۆیان پژا بە خاكا

چرۆی گیان ترەکی
گڤەی سەرسەڕی هەوری وەرچەخاو
وێنەی شاخێکی بەرزی کیمیاوی سروشتی پیشاند
دڵداری مەرگی ئەستێرە هەمو توێنرانەوە
وەیل وەك شۆکە گیانی مەجنونی لە قوڕ هەڵکێشا
دڵۆپە سەهۆڵی مێژوی نەزانراو
گسکی دڕکاوی بارگەی ڕامالی
ڕوپۆی سروشت گەردیلەی سەر کەل
مارش‌و شمشاڵی لۆکەی هەورە بەرد
بە موروی ئاودار سەد چەرخ رۆحە بنێشتەی وەراند
ئاوێنە زێری ئەتۆمی ڕوبار شەوقی دایەوە
گڕو دوکەڵی دەزولەی شەختە
باخچە سوتاوی ئاسمانی جەنگی
گەردیلەی رچەی پەرچەمی گیان چون
رۆژ ئاوا سوپای سەربازی خۆر چڕ
تۆو رۆحی تاشە بەردی خۆر
جیهان کەوتە سەر سکی نۆ مانگە
هێلانەی گەردون فلیقایەوە
قوڕ بو بە بارانی جەستەی پەپولە
فوی پەیامنێری بۆ حەوا مژی
وێنەی ئینجیلی لەسەر چنرابو
قۆپچەکانی هەریەکی رەنگێك بو رەمزی مەسیحی
ئەسپێ‌ی دو جیهان درۆزەی فۆتۆی جیهانیان تیا کرد
بای تونیلە مەرگ

پەردە جەنگەڵی تاریکی شەوە
سروشت تابوتی شوشە قەوزەیی
دەریای شەوەزەنگ پەردەی لا درا
ئەشکی گڕی گرت
بنێشتە تاڵیش بە هەورێکەوە گیرسابونەوە
وێنە قەزامو نیاندەرتاڵ بو
شێیّ گزنگ کیمیاوی خۆرە
هەڵگری بلیارد تابوتە مەڵۆ
ئەستێرەی کەلی بەفرانباری شوم
کۆشکی گەردونی هێنایە لەرزە
باکور بۆ باشور ئاوەژۆی شەتاو
پەیامنێر کەوتنە سەر چاوگەی ئەتۆم
بەڕوی لوتکە شاخ لوتی هەڵبڕی
دەرگای ژێر زەوی خرایە سەر پشت
تەونچنی شەو هاتنە سەر لوتکە
بۆ گیای نەمری
گەردون سیواخی پۆلایی تێزاب
سروشت چوە ناو مەیخانەی بەخت
دوایەمین پێکی مەسیحی نۆشی
کاسی جەواهیر لە بورکانی خاچ
زەوی ترازاند
ئاسمانو زەوی جیقە قوڕاوەی شەوە بەفرە پوش
زەوی بوکی ئاو
سندوقی قوڕی عیساو تاتارو بابلو ئاشور

گۆڕستانێکی هەڵدراوە بو
زاو و زێی سەدەی زانستی مەریخ بەرد کاروانی گرت
ئەستێرە ڕما
تیشکی ئاوێنەی گرانی تەلێکس
یەکەم دڵداری زیندو کردەوە
ڕەنگی هێلکەی گرت
مۆمدانی تاقی هەزار چەرخە شێ
لە ژێرچیای هەڵما بو بە کەللە سەر
منارەی باڵای دوا هەناسەی رۆح
هەوارە نەغمەی سەرابی جەنگەڵ
هەور تکە شێی گەردون دابڕان
باڵندەی مێژو لە شەققەی باڵی ئەبەدیان دا
خرانە گۆڕی شوشە ئاوی ڕەش
فریشتەی خواوەند هاتنە سەر شارا
فویان بە فیقەی لۆکەدا هێنا
روبەر شێ ڕوبەر
تیشک خەو سەراب
سەراب ڕو شوشە
شوشە گڕ بەردی ئەشکەوتە بورکان
کلیلی جەنگی سفر بوی گەردون
بانگەشە چوە سەر پەڵەی هەور
کۆچی جەنگەڵی بۆ ئادەم ژمارد
ڕەشەبا ڕەنگی کرا بەتونا
گزنگ بو بەئاو

ئاسمان خوماری بەر گڕی فۆتۆن
کۆرس سرودی شەوگاریان چڕی
زیبەڕۆ چونە هێڵی ئیستیوا
سێبەر کشایە ناو ئەشکەوتی تار
تابوتە نیگای هەزاران سەدە کەف چرای سەراب
سەراب لە زەنگی ونی تابلۆی رەش
قەلێك دەنوکی خستە سەر زەوی
ئەکتەر سروشتیان خستەوە سەر کۆچ
بروسکە چرۆ بۆ گەردون نوسرا
ژیان خرایە بەر گاسنی ئاو
خەتخەتێن چوە سەر هەواری چۆڵ
کۆشکی حەوت چینەی ئاسمان مۆر کرا
باڵندەی مێژو تەرە بونەوە
کوللە  بارینە سەر گۆشتی گەلآ
چرکە راوەستا
پەردە جەوتینەی گەردون لابرا
گلۆپی سفر بوکی مێژوی خوێن
گەردەلول گۆپکەی جیهانی ڕنی
ئاو لەمەداری سێلاو هاتە دەر
خۆڵ بو بە هەڵم
هەور کرایە قوڕاوێکی نوێ
بازنەی جیهان ڕۆیی‌و بزر بو
جیهان وێنەی کەوتنە خوارەوەی زمانی هەڵگرت
کەوتنە خوارەوەو دابڕان وێنەی جیهان

991/4/20

# تراژیدیای بون

**بۆجاك دریدا لە فەرەنسا**

**خۆشەویسێتی یاری بکە** (...)
**ئەمشەو سەراب فۆتۆی خوێنە**(...)
**یاد کاتژمێری مانگە شەو**
**یاری لەسەر بەختم بکە**
**پەتی ئەزەل گێژاویەتی**
**پزیسکی دواسیناریۆی بروسکەیە**
**جیهان زەنگۆڵەی ئەبەدی جەستەو رۆحە** (...)
**سەمفۆنیای گۆڕێکی داڕوخاو عاشقمانە**
**ئەمشەو ژوانی منو تۆو گۆڕو دڵداری گەردونێکی ئاوێتەیە**
**تۆوی منو تۆو خۆشەویستی هەڵگرتوە**
**بۆتە دەمی تەنیا تیخێك**
**بۆ ناشتنی** (من)و (تۆ)و (ئەو) (. . .)

***

**خۆشەویستی یاری بکە** (....)
**تاقە گۆرێك دەریای ئەوێنی گرتوە** (من)م یان (تۆ)؟
**یاخود تارای نەبوکی دڵدارییە**؟
**منو تۆو خۆشەویستیو گۆڕو مردن**

سەرەتاو کۆتای شارستانین
دوا زەنگی قەقنەسی ئەم رۆژگارەین
دەستت بێنە
گیانت بخەرە گیانمەوە
جەستەت بخەرە جەستەمەوە
من و تۆو گۆڕو دڵداری دەبینە یەك (...)
***
ئای لەو بارانە رەش باوەی گیانی دادا (...)؟
لەو پەڵە بەفرەی کەوتە سەر کۆچ
ئەو ڕەشماڵەی گیانی پۆشی
ئای لە درەختی گزنگ بارانی کەللە سەر؟!
لەم ڕۆژگارە ئاوێتەیە؟!
گۆڕێکی تاك شار جێ دێڵێت
جەستەو گیانێك دەچنە ناوی
جەستەو گیانێك دێنە  دەرێ
خۆشەویستی سەما بکە منم یان تۆ؟!
بروسکەی کاروانی رۆح گڕ دەسەنێت
دەریای ئەڤێنی تیا زاوە
ئەم شەو مێژو سفر دەبێت
چرکە ساتی نەفخی سوری ئەزەلییە
ژیان تەلەسکۆبی رەنگاو رەنگی رۆحە
چاوی سەوزی (تۆ) و (من)
تاقە گۆڕێك کراوەیە
منم یان تۆیت؟! (...)

# جەنگی جیهانی سفر

ئای بۆ سێبەری ژوانی عەشقێك لە میتا زەمەن
ماچی سەر لێوی گەڵایەك بكات
پێكی ژەهراوی كڵاوە بەڕوی نیشاستە گرتوی
بڕژێنێتە ناو پێلوی دەریای سڕ!
تەنافی مەرگ شاخ و دەشتی گرت!!
هەتاو هەناسەی خنكاوی مەلە
زریان و گۆپكەو شەستەی وەریوی گەردیلەی گیانە!
بوكی كیشوەریگیانی بێ جەستە
بە شادەماری ئاوێتە خۆڵا تریشقە دێنێ
مەلۆی تابوت و تەرمی خوێن گرتو
بون بە خومخانەی كەنارێكی رەش!
بۆشایی هەور پزیسكی كشا
شالاوی رەشاو مێژوی شاردەوە
زەنگی چەمەری شارستانی چۆڵ پەیامی رۆژی حەشری تێدایە!!
هەناسەی تەم و تێزابی پێش ژین گزنگی پۆشی
شارای تێكەڵاو كەوتە سەر سروشت
موی پساو ریز بو
زەریای رەشاوی بۆ باكور هەڵبەست
بسكی كچۆڵەی جەنگی سەرەتا
ئاوێنە نەستی زەمەن و گەردون

سروشت داڕزی
کلاَفەی خۆرەی کەوتە خوَلەوە
تاڵیشکی قژی قۆزاخەی هەور
بو بە ئاوێنەی گیان توانەوە
شەوگەرد تۆوی ڕشتە ناو منداڵدانەوە
زەوی چاوی ڕشت
مێرگی گیان کێشی مەسیحی دڕی!
سەرچاوەی گیانی توخبەی نەمری ...
سەرکەلی شەختەی پۆستاڵی هابیل
قابیل لە شیشەی ئاوێنەی مەرگا ئاوە چۆڕی کرد!
بەرگی مارشاڵی لالەی پۆشی بو
ئاوێنە لەبەر برژانگی تیژا ئاوە ژو بوە خەوی کۆتایی
یوسف پێغەمبەر
مورووی مستیلەی پەنجەی سلەیمان
حەوت سەر هاتبوە خەرمانەی هیوای نەخشە بەندەوە
پەرچەمی هەوری سوری قژە خەو
بو بە تەلاری پوشی مەنجەنیق
زریانی خەوی ساوای گەرمەسێر
فوی دەکردە سەر حەوت چرای دانتی!
دەماری شەتلێ ناوەندی کردە شەبەقێکی سور
نیشانەی خەزان ئەبریشمی چوە سەر تاری هێلی ئەفسونی بوکێك
چەقی خۆر بو بە کلاَو ڕۆژنەی مەرگ!
سێبەری تاعون بەرپەرچی نیگای کابوسی ڕۆژگار
دلۆپە مرواری ئالاَی کەشتی نوح

تۆزی گەردانەی قەقنەسی بیچو ژەنگی مەرگی گرت
نسێی گۆڕستان ژەهری خوێن ئامێز
دڵی زەوی کرد بە خەڵوزی ڕەش!
چەخماخە بزەی گەروی مێرولە زەوی هەڵتەکاند
پرژەی سکی خۆر بو بە ئێسکی گوڵ چرۆی چەرخ
چاو شارکێی هەور روخساری قەوزەی ماسی گری زەمەن
مۆمیای هەزار ساڵ
باروت سوتێنرا
خومخانەی زانست پلە گۆشتی خۆڵ
بڵێسەی شەختەی بۆشایی ئاسمان
وێرانە خاکی چرکەی کۆتایی پرشەی گەردەلول
جیهان بە جۆشی مزگەرێکەوە سوتاو خامۆش بو!
هەوێنی مرۆڤ قوڕی بناری شاخێکی داچوی
خشتی ئاوریشمی دەزولە مێشك
تەنافە لۆکەی درەختە رۆحی زەمەنی ئاوای
تەرمە تابوتی کرێوەو پشکۆ
ئەشکە کیمیاوی زەریای جەنگی کۆ
ئاپورەی تەمی رۆژگاری گێژاو
شەمەندەفەری باکورو باشوری خستۆتە سەر ڕێ
ستونی سوپای خواوەندیان پێ بو
هەتاکو تەرمی پێغەمبەرێکی تازە بنێژن!!
ساتەوەختی گسکی هەتایی سروشتی چنی بە تەرمی تێکەڵ
بۆشایی هێڵی پەردەی کۆتایی
کۆتایی بازنەی چقڵی هەتایی

ئەستێرە ژاکاو گۆپکەی هەڵوەری
تیشکی خەفەبوی لەناو تونێلا تەقێنرایەوە
چرکە ئاژێری دروێنەی سفر
رەنگی تێکەڵ بو!
هەڵپژایە سەر بێشەڵی سروشت
ئاوێنەی زێڕ نەخشی کۆشکی پەپولە
بو بە تۆو کێڵگەی خرۆکە هێتلەر!!
چرای ژین لەرزی فوی خەوی خوێنی بەسەردا درا
ئاسمان تینوی دڵۆپە خوێنێك
ئەستێرە شەیدای شەهوەتە ئاگر
باران خرۆشی هەلکە سەمای گرت
بۆشەوی ئاڵی بوکێنی شەوێك
بێ تەمی زڕی حەوا خامۆش بو
گەشکە سەرە مەرگ تابوتی لێوی هەتاوە لۆکە
دەزو ترازاو ئاسمان تێك ترجا!
زەوی عەشقە سوێی گەڵای خۆرە گۆشت
ئێشك چی دڵۆپە گەوهەری پزیسکی تیشك
بێ پەیامی خوا هەزارساڵ وەستا!!
نیگای هەڵفڕی ئەو چاوەی نەدی کە توری سوتاند
ئەو فوە کرا بە پارچە سەهۆڵ کە کەوتە سکی مریەمی مێژو!
جیهان سەر خەوی مێشکە فیرعەونی
روخساری تەمەن لقی سێدارە
بە گڕە چەخماخەی هەویری تاعون داپۆشرایەوە!
تاجی پاشایی سیواخی شێ بەرد هاڵاوی کۆشك

بروسكەی رۆح هات !
كاتژمێری سفر لە خوێندا وەستا(...)!!
ژیان ئەشكی رشت ..
منداڵی ساوای سەر كەلی ئێسك
رەشماڵی ژەهری كوللە كوژیان گرت!
زۆنگاوی ورگی هێرۆشیمای مێشك شالاوی هێنا
خەرمانەی مێژو كەوتە بەر با رەش
لە تاقیگای جەنگی ماتماتیكی ئاو رەنگی مەرگی گرت
چاویلكەی ژەهری رۆپۆی بینایی دواكەشتی سەر مانگ
كفە درۆزەی شێی سەرەتان گری گۆپكە ئەفسانە
شوشە سەهۆڵی شەختەی مێژوی چەرخ
وێنەی یەئجوج و قەزامی باریو!
سروشتی پۆشی بە پروشەی تێكەڵ!!
خاك بوە تۆوی كێڵگەی شەوارەی شەوە تلیاكە
ئاوێنەی سپی مەلی كۆچ كردو لە بارێزەدا
هیوا سەرابی وێڵی دیدە كوێر
بو بەمنداڵی چاخێكی بێ تۆو!
بێ ئاو و هەوا كەوتنە كۆشەوە
لاپەرەی گەلای نەزانراوی دار جیهانی هار كرد
ساڵ بە دوای ساڵدا گەرێنرایەوە
تەمەن لاسكی گوڵی هیوای خوێن
گیلن چوە تێزابی ئاڵتون توێنە
پەرداخە زێری زوحەیلی پر كرد
خوێنی هەور سەوز بو!

پێكی رۆح رەنگی تێكەڵ بە خۆڵ بو!
كوللە شەرابی خەزانیان نۆشی
بون بە تلیاك خۆر!
شەوارە تەرمی شەختەبوی مێژو هەرەسی هێنا
مۆمیا بو لەگەڵ  رۆحی تواوە
دوا زەنگی چركەی ئەتۆمی لێدا!
مەمكۆڵەی زەوی ریشاڵە رەگی مەرگی هاتە دەر
نیگای چوە سەر كەلی گیان هەڵكێش
تۆوی ترەكیو لە شیر چونەوە
گیان لە دۆڵێكا خۆری لێگیرا
تۆوی لۆكە كفن پێخەفی تابوت
پەڵە هەوری زەرد زەریای خوێناوی باڵندەی تەرە
كڵپەی ئاگری گۆڕ دزی هەتاو تابلۆی بایەقوشی نەخشاند
گەڵا هەڵوەری!
باڵندەی ترەكیو چاویان هەڵهێنا
تێزابە دەریا ژەهری شوشە خوێن
بروسكەی هەور وەریە ناو رۆح
گەڵای نەمری مەمكی ژیانی بێ شیرەمەنی
بو بەهەرەسی چەرخی بێ زمانی!
تۆوی منداڵدان یەئجوجی خستە بێشكە دارینە!
چرای دارستان هەڵمی لێهەستا
پێكی ئاوەژۆی ئەفسانەی پڕ كرد
ژین لە مەیخانەی شەوە تریشقەی بێپەیامی خوا!!
رەنگی بو بە سەگ!

ئێسکی دامرکا!
زەوی شەقی برد!
ئاسمان شڵەقا!
خاك رۆ چوە ناو ئاوی دەریاوە!
گۆمی کێماو تاقی کیسرای نەخش کردەوە..
گۆڕی زێوین بە خاکی ئەمریکادا پەرش بونەوە!
جیهانیان کردە کلاًفە دەزو !
سکەی پۆلا رێز وێنەی شارێکی کاول‌و خاپور
خوێن بێشکە سوتاوی بۆشایی سفر
شاپەڕی وەریو ئاو درا بە تکە
وەك بەفر ماڵی جەنگی ساردی تەم
لانکەی ژەم بوردەی منالی حەوا
پروشەی گۆشتیان دەباریە خوار!
ئاگرو تێزاب شەختەی گوڵدانی مەیی ساتە وەخت
باڵداری سەدە لە باخچەی ژینا مۆمیا بونەوە
پۆلە پەپولە کەوتنە ناو بورکان
گڕی هەزاران سەدەی بێ پەیام
ئاسمان‌و زەوی دارمینە خوار!
جەستەی بێ گیانیان گرتەوە ئامێز
مژدە ئەسرینی دەسڕی فریشتە
بون بەئالأی کۆشکی هەناسە
سەراپای جیهان کوللە لێی درا
گەردەلول سەرو ژوری ڕاماڵی
تەرزە پەڕۆی بوکێنی چەرخی شتەوە

ئالآی سەوزو سور خۆرئاوای پێچا
گەردون بو بە تاتە شۆری زنجێکی کۆنە
شەو چرینی گیان چوە سەر کۆشکی مەنجەنیق
مانگ‌و خۆڵ‌و خۆر پرۆڤەی مەرگی باکورو باشوریان کرد
زەوی بو بە بورکانی چیای رۆح و خوێن
ئاسمان چەقێکی قیبللە نومای رۆژ
بۆ دابڕانی هەورە سەوزەکان لە کاروانی خۆر!
زەوی تابوتی تازەی خوێن گرتو
ئەشك دەرژێتە بەرپێی مردنێك
گۆڕ هەڵکەن سەرجەم گەیشتنە سەر مانگ!
هەزاران گۆڕی تەختەیان بۆ برد!!
سکە ئاسنی تەختە خوێن‌و گۆشت
چرای گیان کێشی گەلآی هەڵوەریو
ئاسمان‌و خۆڵ‌و هەوایان دڕی..
چەرچەفی سروشت جەنگەڵی سوتا
پێنج قارە نسێی ئالآیان هەڵکرد
سەربازی ستون تابوت‌و تەرم‌و خوێناویان پژا
بەردو دارو گڵ ئاوڕشێن کرا
ڕوداو بە کەفی تێزابی مێژو بون بە کاغەزی ڕزیوی بێفەڕ
منداڵێك گۆشت‌و ئێسکی هاڕابو
خوێن چونی ژینی کرد بە خەتخەتێن!!
جەنگی جیهانی سێهەم بەسەر چو!
مەڵۆی شارا زێرِی شاری پەپولە
وەرینە گەروی بورکانی خەڵوز

لوتكە مۆرەخە بو بەسيناريۆى زامى رۆژگار
پەپولە سەوڵى حەشوە ئاگرى بۆمبى نەوەوى
نيگارى جيهان خۆڵەمێشى زەرد
فليمى مێژوى گەردون سوتێنرا!
ڕوداوەكانى بە باڵە فرێى دوا هەناسەوە
بون بەگوڵى سوتاوى ڤيستيڤاڵى بون
قورئان پەيامنێرى زەمەن دەكاتە ئاماژە
لە چاخى شومى خوێن بارانا
سزاى ئەيوبو مريەمو مەسيح
بو بە ئاڵاى رەوەزى چيا
(گەردونيش تەنيا هەڵماتە شوشەى سۆزانىيەكە!!
لەبەر تريشقەى قامچىشەوەيا
بروسكەى هەزار چيرۆكى نوسى)[1]!!
ئاوەچۆڕى مەرگ لە شا دەمارا هەرەسى هێنا
خوێناوى بەستوى هەزار رەنگەى خۆڵ
چەقىيە كەڵبەى گرانى چەرخ
سێكسى سەر گەڵاياساى مردنى تۆمار كردەوە
بە رەوەزێكى بەردەڵانە گۆشت
گڕى سەوز باوى هاتەوە سەر خۆڵ
دەريا شەهوەتى شەپۆلى خوێناو
عارەقو شەهوەت خرانە پەرداخ
تەواوى جيهان سەرخۆشى مەى بون!
گەڵاو گوڵ كەوتنە سەر هێڵنجى مەرگ
شيلەى شۆكە شێى گەڵاى شەوچڕ بو

ملیارد پەپولەو هەنگی پێ سوتا!
تەمی گێژاوی مەرگەساتی دو
لاپاڵە گڕی فریشتە سوتوی خوێناوی گوشراو
بەچکە سوتاوی خستەوە تابلۆ!
هەر مۆرەغەیەك تابلۆ مۆمدانی شوشەی فەرحان بو
شیشە ئەتۆمی چوار ڕوی پێك هێنا
هەوری مەنجەنیق هێڵی گۆڕستانی سەرابی هێنا
مردو کرانە دڕندەی سەر کێو!!
چەرچەفی جیهان شیلەی کەوتە سەر
شەو و ڕۆژ ونبو!
بۆ هەزارەها مێرد منداڵی شۆخ
گونیەیەك ژەهری عارەقاویان ڕشت!
دێبەری شەتڵی خۆرە لە ئیستیواوە
سروشتی خستە پەلە قاژێی تۆف
لاسکە نسێی تەرویەکی چڕ هەناسەی خوێنی هەڵکێشایەوە
هێلکە یەئجوجی قڵیشی هێنا!!
هەروەکو گەڵای شوشە خوێناوی کردۆتە باجی نەو بوکی شەوێك
شەتڵی شەهوەتی راماڵییەوە
زەنگی ناکاتی تەرزە دەفتەری ژینی دارێژا
رایەڵی مێژو شارای سەوزو سور
ئاوەژو بوە شیلەی لەبارچون
لافاوی مێژو رۆحی وشك کرد!
پشیلەی قەزامی سەر مانگە کەشتی
ڕێی ژینیان گۆڕی!!

هەوا پۆشاکە زەوی شەو چڕێن
ئاو وشکە داری کۆچی فەزای بون
گەلا بەهارەی خەزانی تەمەن
خۆر بو بە کابوس
مێرو لە لاڕێی هەوارە گەنم
سێ چرکە ئاسمان ڕاست وچەپی کرد !
ئەستێرە ئەشکی نزایان هەڵڕشت
جیهان هەزار جار تەخت وکاول بو !!
ئاژێڕی شەوە گەردون خرۆشا
چڵمی منالان ئاسمانیان تەنی !
بسکی هەڵکەنراو لچکا بەمەمکی حەوت چینەی ئاسمان
بلیارد مەلۆتکە هاتنەوە سەر خۆڵ !
پروشەی شیلاوگ خوێنی داپۆشی
بروسکە سوژن باخچەی پەپولەی بەتالان هێنا
هەتا دوا شیلەی ئێسقانی کۆتا
هەزاران میل قەسابخانە لە خوێنی هێلکە سەوز بو
قەزوان ومازو بار بنە خوێنیان شیری لێ چۆڕا!
ڕەگ وریشاڵی دەوەن گڤەی مەرگی هەتایی کرد
ژیان خرایە سەر سەمای لۆکە چنی کێو
دەزولەی ڕەگی هار بونی زەوی
بلیاردێك کاژێر بو بە چرکەی خوێن
شانۆ چۆڵ کرا شۆکە نەباری
ئەستێرە ڕەنگی تێکەڵ بو بە قوڕ
شارو شارستان جێگۆڕکێیان کرد!

جیهان خولی خوارد !
ئەستۆڵی جەنگی دەریای شڵەقاند
گەردیلەی وردی ڕوح توایەوە!!
خرۆکە پشکۆ جەنگە گەردونی چەرچەفی ئاسمان
فۆتۆنات تەقی!!
جیهان فوگری سارای لماوی
مەلی ژین فڕی!
تەرمەکەی حەوا زیندو بوەوە!!
لەناو ڕوانینی گۆڕی ئادەما خشڵی بزر بو
فۆتۆ جیهانی خستە شەختەی مەرگ
قابیل هابیلی مێژوی کوشتەوە
چیرۆکی مێژو دوپات بونەوە !
بە تەنها مریم زیندو نەبۆوە
بو بەسەر تۆپی ئاسمانە شوشەی ساڵی گرانی!!
شقارتەی کڵپەی بورکانی دۆزەخ
بو بە ئەتۆمی پەڕە شیلانە
لە جەنگی سفرا سروشتی کردە تابوتێکی ڕەش
تۆ وچەنی ڕوحی بەر گەردەلول هات!
ستالین تیشکی گرتە هیمالا!
هیمالا ڕێژنەی ڕشتە سەر زەوی !
هەزاران ئاڵا لوتکەی زەویان داپۆشیەوە
سوژدەیان بردە بەر تەختی هێتلەر !!
ڕێژنەی تەنافی بەچکە پشیلەی لوتکەی بێ نەخشە
لە ئاسمانەوە پاڵاوتەی بەنزین لولەی پەنای عەشق

**شمشاڵ ژەنی خۆر نیگا سەر بڕاو**

**تۆوی یەکەمین مرۆڤیان داچاند!**

**بە دوای زرنگەی مارشە کاتژمێر**

**ئەکتەر هاتنەوە چەرخی نەزانراو**

**شەو ورۆژ هێلکەی زەوی تێکەڵ بون !!**

**هالآوی هەور بو بەشەرابی گرانی چەرخ!**

**دەروازەی گەردون تەنافی هەوا**

**هەڵوەریە خوار!**

**پریاسکەی مێژو والآ کرایەوە**

**فویەکی ناکات لە خۆرئاواوە**

**ڕچەی شەوارەی گەردونی نوسی:**

**لە سفرێکەوە بۆ سفرێکی تر (...)!!**

---

**ڕەخنە گر (ئیسماعیل حەمە ئەمین) کۆجیتۆی باوك لێکۆڵینەوەی ڕستەی شیعری لەسەر نوسیوە لە ڕۆژنامەی برایەتی 1635ی 1993/5/3 وژمارە 1650ی /1993/5 بە دو ژمارە بلاّو کرایەوە وبەشی سێهەمی وەستا.**

# ن والقلم

**ئۆپێرایە.. ئێپێرای خوێن!**
**گەلا قرِان کەوتنە خوارەوەی پوح وبون**
**ولات رەنگی دەروازەکانی باستیلە**
**رەشماڵی خوێن چینی ئاسمانی پۆشیوە!!**
**هەمو زامێك کوێر بۆتەوە**
**تەنها چرۆی هابیل قابیل پرۆحی نوێیە**
**قەڵەم نەشتەر بە زەویدا بێنە**
**مێشك شیشەی خوێناوی نەوبوکی ساڵە!**
**زەنگ بەگوێچکەی زەوی‌و ئاسماندا دەهێنێ!!**

* **

**(ن والقلم) سوێندی خودا**
**پوح پێخەفی تونێلی خۆری ئاوا بو**
**لە میحرابی گیانی وێلا سەفەر دەکەیت**
**بۆ برینی پوح وجەستەی سێ کوچکەی خاك!!**
**ئەستێرەی بەخت کوژایەوە**
**لە کەللەی نەوبوکی ساڵی خوێنا تۆمار بوە!**
**ئۆپێرای پوح بونی هەژاند**
**تارای عاشورای کەربەلا وکەوتنە خوارەوەی رۆحی سور**

***

**تراژیدیای لە خاچ دانی هاوچەرخییە**

فۆتۆ کۆپی مێژوی تاوان کەوتە چرکە
بەداستانی سەبرا وشاتیلا ئاوسە
ئێستا پرسەی وڵاتەکەم کشایە هەور
(ن والقلم ومایسطرون)
***
قەڵەم ..قەڵەم ئەشکی زەوی تۆمار بکە (...)
کلیلی کەلەپچەی خۆر بو بەرۆحی کۆتایی !
یاری لەگەڵ رۆحی تەریو بکە
کەشەی کوشتاری ژین ئەستێرەی بەختی عالەمە
لەم خاکەدا دۆزەخ دەردەکەوێت!!
هێتلەر ومۆسۆلۆنی وناپلیۆن هاتنەوە گیان!
جەنگیزخان هۆلاکۆ وفیرعەون وشەداد
تورەکەی خوێن بەجەستەی خاکا دەهێنن!
پاکیزەی خۆر دیلە لەتونێلی هەورا
تۆوی مەرگ جوگرافیای گرت
قەڵەم فریشتەی دایەلۆژ رۆحت بشۆ
ئەستێرەی مژینی تاوان کوشتارگای رۆح
لە وڵاتی بارانی گۆشت
بە کوڵ بگری بۆ مەرگی خۆت!
زەوی و درەخت ئەشك رێژ کە
بفڕە بەدوای خۆری ناکاتەی ئاوابو
زاری کۆرپە لەمەمکی خوێندا بزواوە
خوێن بەکەللەو کەللە بەخوێن تینو بوە!!
***

قەڵەم دەروازی مێژو بزر بو!
چرای تاری هەڵكراوە
سەرچۆپی كێش چۆتە ئەشكەوتی خۆرەوە!
ئەم وڵاتە كاول برسی
رۆژ بەتەنها لەقەسابخانەدا هەڵدێت!
خاكی مەرگەسات و تابوت
دڵ و خوێن و چاوی سەركردەكان لەكۆچ دایە
رۆشنایی بەچاویلكەی زەرەبینی تەڵخ بوە
تەختەی تابوت هەمو ماڵێك رادەماڵێت!!
تەنها كۆشكی سەركردەكان رەنگاڵەیە!
***
قەڵەم درەختی مەرگی كۆرپە مەمكی دڕاوی ناو بایە (...)!
دارستانی سەربڕینی قەڵەم ئەستێرەی كۆمەڵە
گوڵە گەنم لەئاسماندا سپی سپی
چرۆی مانگی كورد كوژی یە!!
تەختەسڕی تەمەنمان مێشكی پڕاو دێنێتە یاد!
لەو زەرەبینە ئاگرەی گیان دەكێشێت
زەنگی ئەزەل جەستە دەگرێت!
سێدارەیەك رەمزی گەردون
رۆژگار وێنەی هێلكەیەكی فلیقاوەی هەڵگرتوە!!
***
قەڵەم كەشەی ئاسمان رۆحی زیندوی پێیە
تۆ تەمەن و وێنەو رۆحی خۆتت دیوە؟!
تۆ خەرمانەی عومری منت خوێندۆتەوە؟!

شێی شیلاوگی دایکەکانت ناسییەوە!
کە دەستاڕی برا کوژی وێنەی گرتبێت!
تۆ شاعیرێك هاوڕێت بوە تیرۆر بوبێت؟
ئەو ئەستێرەیەت تۆمار کرد کە رۆژ کشا!!
بومەلەرزەی کوردستانت بیردێتەوە
***
(ن والقلم) سوێند بێت بەتۆ (...)
رۆژگاری تاریك حەشارگەیە
پرسیاری خوێن ببارێنە!
وا کاروانی گۆڕ هەڵکەنی چەرخی بیستەم کەوتە سەر ڕێ
قەڵەم کلیلی زمانی شاراوەی خوێناو
مێژو ببرە
داستانی مریەم لەدڵتایە
هۆمیرۆسی برا کوژی کوردت دیوە؟!
قەسابخانەی ساتە وەخت کەوتە گزنگ
(ن والقلم ومایسطرون) سوێندبێ بەتۆ (...)

---

ئاماژەیە بەئایەتی (ن والقلم ومایسطرون) سورەتی (القلم).

# شیلاوگی جیهان

خۆر سەری سۆزی خستۆتە کۆشی شەوە زەنگەوە!
تەوقی تەنراوە بەپەت و ئاگر و تەناف و زنجیر،
مەڵۆی قژیشی شەپۆلی خوێنی سەر شێتی مەرگە،
تێزابی وەیل بۆتە ملوانکەی بوکێنی شینی..
سینەی دڕاوی چاڵاوگی ئەشك و سێبە ڕۆی ژانە!
هاوار و ناڵە دەبارێتە خوار،
لەگەڵ دوا تەزوی خاك و خۆڵ و بەرد
چزوی نەعرەتەی بەسەرا دەپژێت!
لەژێر شاڵاوی هەناسەی سوری نیوە مەرگیەوە
جیهانیش بۆتە تەختە شۆڕێکی مردنی ناکات
سێبەری تابلۆی ڕەنگ و روخساری
شێوەی تەرمی کۆن تیشك دەداتەوە
لە هەمو لاوە سینەمای ، نسێی ڕەشبەڵەکێکە
گەمارۆی جادوی نێرەکەرەکەی جەجاڵیان داوە
سروشتیش چرکەی گەردەلولێکە
لە بنج و بێخی دەوەن و هەردا:
فیچقە دەهاوێ بۆ سەر پەلی هەورا!
لە چەپ و ڕاستی چارەکەی سنگی گیان دەرچونێکە

باوەش دەهاوێ بۆ گۆڕستانی مردنی بێ‌جێ،
گژو گیاش نەوبوکی سوری لانە سوتاوی
تەوقی عەزازیل، مەرگی ساکار و زەقیان پۆشیوە!
مژدە دەڕێژن بەسەر هەواری سوپا سالاری،
گۆڕێکی چۆل و ئاوارەی بێ‌دەنگ!..
رەشماڵی دەستەی مۆسیقا وشانۆ
بونە شای چراو هەمو رەنگێکیان گرتۆتە باوەش!
لە بەڕۆژەوە تا نسێ و تەمو هۆڵی تار و مار.
چراخان دەکەن بەسەر تەناف‌و دار تەختە و خەزان
گەرمە سێری وشك بۆتە بەربوکی مێشکی زریانێك،
سروە و شەپۆل و نەسیم نابێتە بالآ گەردانی
پەڵەی تەمێکی لەقوڕ دراوی بێ تام و بۆیە
پەنجەی پیرۆزی پێغەمبەرەکان نایان سڕێتەوە..
شارستان هەموی تاریك و لێڵ و نوخشەی ناشتنە
خەتی کوژاوەی کوێرە رێیەکی لاپاڵی شوانە
پردی سیراتی ئەفسانەیەکە سێبەری دەکشێ"
کوێر و چاو ساغیش دەکاتە هاوڕێ.
چی گیانێك هەیە هاوتای عومرەکەی نوح بکاتەوە؟!
غەمی کەرەنتوی دروێنەی شەپۆل لابەرێت لەدڵ!
پەردەی هەمەجۆر لەحەوت تەبەقە
داگرێتە ناو کۆشی هەتیوی پڕ سکڵ‌و دو کەڵ،
تاقە جارێکیش فۆتۆی تەلاری بەهەشت و دۆزەخ
بگرێت لەوێنەی جەجاڵ و مەهدی
میراتی مەهدیش بخاتە سەر هیوای،

رۆڵەی نەبوکی دایکی زەوی
خاك دەسرازە بەنی گیان کێشانێکە
بێشکەی ترساوی نۆبەرەی کوشتن دەلاوێننەوە
دایکیش نیشانەی توخمی خوێناوی لێك هەڵپێژاوە
گۆرانی سۆزی لایە لایەشیان سرودی گریەو
کەفێکی سپی تازە تەقیوی نوقمی ناو ئاوە
باڵندە و مرۆو مێروش ژیلەمۆی دڵی خورپاوی
سێبەری هێزی تەزوی شاراوەی موغناتیسێکە
بەتاڵی پرچی شێواوی  رەشی دیلی خۆرەوە
بە شەش پاڵوی قوڕ دەنگیان گیراوە،
لەکونی زەقی مورووی ئاوداری زمانی حەشرا"
دەنگی مەلۆتکەی نۆبەرەی کاتی مەرگ دەداتەوە!
شێی رەشبەڵەك و دەواری شیوەن
لە کۆڕی پرسەی ئەو فریشتانە ریزیان بەستوە
کە بۆ یەکەم جار  جەرگی یان هەڵدڕا"
بە بێشکە ژەنی قەسابخانەی تەم لایە لایە یان...
کرایە جۆلانەی شێواوی زریان ،
لەگەڵ دوا پەڵەی هەناسەی تیژی بارانی قینا!
تکەی خوێنیشیان دارژا بەسەر سروشتی وشك و
خاك و خۆڵێکی بێ مرۆو گیاندار!
گەردەلولیش بو بەسواری پێش کاروانی شەڕ
لەخاڵی سفر و کۆتاییەوە کەوتنە سەر رێ.
کراسی تازییەی کۆن و تازەشی بە بەرا پێوا
لە یەکەم خشەی دەنگی جولانی هێزی کاروانا

دومەڵو زامی بە سەردا تەقاند
گەرداوی سەختی ئەو زامە چۆپی رەشبەڵەکێك بو
هەتاکو ئێستاش پەپکەی ژەهراوی پڕ لەکێماوە،
خڕ دەبێتەوە لە شادەماری شاڵاوی شینا
لە هەر شەپۆلێك گڕێکی سەوز و وەنەوشەیی دێت،
لە هەر لافاوێك نەك زەوی، بگرە ئاسمان دەسوتێت
مرۆڤایەتی تەشیی رێسراوی کچێکی سۆزانییە..
گۆڕەکانیشی وەك پوشو پەڵاش پڕ دەبێت لەئاو
کچە قەرەجی تەختی نەبینراواندا دەسوڕێنەوە.
بارانیش لە هەوری سەر زەمینەوە دەچێتە حەوا،
ئیسرافیل ئێستا مژدەی نەوبوکی پێغەمبەرێکە
کە لە تەورات و ئینجیل و زەبور باسی نەکراوە!
تەنها نەشتەری سەر زاری خەڵکی دەوری مەهدییە
لەناو جۆلانەی پشت قوللەی قافا تەل بەند کراوە،
نە بارانێکی روناك و شینی پڕ پەڵەی خۆشی“
نە لە تروسکەی بەری بەیانا گۆپکەی دەتەقێ.
ئەی هەور و رۆژ و مانگ و ئەستێرە نایەنە وەڵام!!
کێ بەر پرسیارە لای خواوە دەنگێ بەرز کاتەوە؟!
رۆژگار بەکڵپەی تەنورە، گڕێك دەسوتێتەوە،
پۆلە فریشتەی قوربانی دەوێت ببنە گوڵ چرۆو،
لە تەخت و بەختی پڕ شکۆی خوادا بتوێنەوە..
رایەڵی تەونی ئەفسانە ی رۆژگار نابڕێتەوە
لە دابەزینی حەواو ئادەم و دوای خۆیانەوە،
هەتا لە وەحی دوا پێغەمبەریش هەر پیشی خواردو“

هێزی بورکانی شیوەنێکی وای خستە ناو باوەش
ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژدا کپ دەکرا دەنگ و هەناسەی
تا لە زڕ زڕەی پشت و هەناوی لاشەی سەر زەوی
بو بە بروسکەی شارای دڵێکی  پڕ جۆشی سروشت
بۆ تازیەی ڕۆڵەی  دوا پێغەمبەری
بە هەزاران میل لە شانشینی سکی خۆیشییەوە.
پرسەی فریشتەی کردە خۆرەی دڵ
وا دوا هەناسەی وێڵیان چەخماخەی گڕی بورکانە
لە دەریای هاواریانەوە چاوشارکێ دەکەن
لە شەپۆلاوی خونچەی تکەی خوێناوا
دەبنە ملوانکەی دوڕ و یاقیقی ملی سەر زەوی
لە زوهرە و مشتەری و کاکێش و لەیل
سەوڵی کەشتی  واوەیلا و شینە
بۆ دوا هەناسەی گەردانە وردی کپ و خامۆشی"
ئەو پێغەمبەرەی نەچوە سەر تەخت!
ئەو فرمێسکانە ئاگر و ئاوی لێك هەڵپژاون دەچنە حەوا
بەدەم تێزابی دۆزەخێکەوە.. دەبارێنەوە..
دەبن بە بەردی یاریی هەڵماقۆی سینەی کوتراوی"
ئەو فریشتانەی پێش ئادەمیزاد
پەتیان بۆ خرا
بە زەبری شیری سپیو قەترانی کەللەیان پژا،
جەستەکانیشیان خستە ناو تێزاب
بروسکەی تیژی ئەو شیرە شەوقی لە بەژنو سینەی
ناو کەژو کێو و شاخ و پێدەشت و دۆڵادایەوە

له پێش کرۆکی. ئادەمیزاد و شەهوەت و خوێنا..
ئەو پەتە وێنەی دڵێکی نەمر کەوتە سەر ترپە
تەزوی شەختە بو دێنێ بەجەرگی مەریخ و مانگدا
وەك بە ئاشکرا نوکی شمشێرە کەی خۆی"
بینێ بەجەرگی مرۆڤ و ژین و مردن و کاتا،
نەك ئەوەش بگرە وەك کەرەن تویەك
له هەمو لاوە بکەوێتە کار
بە مەڵۆ.. مەڵۆ، تەرمی تازە خوێن گەڵاڕێز بکات،
لاشەی سور ئێستا بۆتە سرودی کێڵگەی تۆوی خۆر
تا گەڵاتی درەخت چەقۆی ناسکی بڕ بڕەی خۆیان
له کەللەی مۆمی خوێناویانا دەهێننەوە
ئەوانیش دەڵێن.. سزای قەنارە و هاوار و کوشتار..
له پێش خەنجەری هابیل و قابیل
له نوکی چەقۆی  خواوە مایەوە،
له و تەرمە سپییە بێ نازانەوە، تەوژمیان هێنا
بۆ چنگێ خۆڵ هاتنە زەوی بێ کۆرپە و رۆڵە
هەتا مرۆڤی شێوە مەیمونیان لـێ دروست بکرێت
هەرچەندە گیانیان مەلی ئاوازی کۆشکی فیردەوس بو
خوا بۆ زیندانی زیبەرۆی زەوی تەرەی کردن و
دەنوکیان بو بە چنگاڵی خەمی شۆفلێکی تەم
بۆچی دەنوکیان لەگەڵ خاك وخۆڵ کەوتە گفتوگۆ؟!
هەر بونە هاوڕێ نەفرەتیان باراند!
ئەویش بەخوێنی چەمۆڵەی مەستی ئەوانا زیز بو!
بە هاوارەوە کەوتە سەرچۆکی سکی نۆ مانگی،

لەو پزیسکەوە هەتا ئەم ساتە کەس نەیزانیوە
ئەم خۆڵە رەش‌و سورو زەرد باوە بۆچی گریاوە؟!
ئایا پێش ئەوان مرۆڤی تری گرتبوە باوەش"
تا لە کۆمەڵگای پێشوی نەزانیا دەست بەئاگر بێت؟
هەرچەند ئەو کاتە دایکێکی شێت بو.
لە پەلە قاژەی ژیان و مەرگی کۆرپەکەی گریاو
هەناسەی گەرمی دڵی بە سۆزی فریشتەی جۆشاند
بۆیە یەك دوای یەك بە دەستی بەتاڵ هەڵکشانەوە
لە بەردەم خوایا سوژدەیان کێشا
هەر ئەو ساتە بو لەناو سێبەری کاروانی وێڵا"
بون بە ئارامگای گۆڕێکی نەدیو،
بە سکی پری خوێن و شیلاوگی زەویا پژان
لە میزەڵانیا قورو شەهوەت و خوێنیان دەرپەڕاند
تەرمی بێنازی شل و پلیشیان تیا تلایەوە
هەر بە شێی نسێی ئەو تەمەش ون بون
تەنها وێنەیان بە شەوق و رەنگی تورەوە نوسا
ئەویش ئاوێنەی دێر زەمانیانە...
شارای مردنی ناوەختەی رەشیان کۆدەکاتەوە
ئێسك و گۆشتیشیان لەدانەی نەختی دوڕو مرواری
مرۆی بێ بەش کرد... نەبوە تالانی حونەین و خەیبەر
گۆی زەویش رزی بەداری وشکی لیژنە کراوی"
لە دوای کۆچیشیان شین و شەپۆری گشت سەدەکانی،
ئەو ئەفسانەیە بێ شوێنەوار و شانۆ مایەوە!
کەسیش نەیزانی ئەو شیرە سورە تیژە بێ دەنگە،

کەوتە کام دەریا و روبار و چۆم و ئۆقیانوسەوە؟!
ئاخۆ وەك تەختەی کەشتییەکەی نوح!
بە سەر سینەی کام لوتکەو پێدەشتا گیرسابێتەوە؟
کاوەی ئەم رۆژە راوچی پێ یەتی نێچیری ئەوە
هەتا بە کورەی ئاگری قینی
لە دڵی برۆنز و مس و زێڕ داریا
تکەی خوێناوی سوری ئەم ژینە شومە بهێنێتەوە
ئەو پارچە رەقەی بۆتە کەرەنتوی ئادەمیزادو
ویسامی شانی چەپی ئیزرائیل
پریشکەکانی کرانە خۆرەی دڵێکی سەرکەش!
لەژێر مەدالیای ئافەرینەوە داباریـنە خوار..
لاشەی ئەوانەی کردە بارێزەی بەری بەیانی"
لەگەڵ دوا چرکەی هەناسەی شین و سزای مەرگەوە
گێژەڵوکەی شوم بوە میوانی ئەم خاك و خۆڵە!
لەو ساتەیشەوە بێ پسانەوە شالاو دەهێنێ!
بۆتە پێشەوای کاروانی تۆف و نابڕێتەوە.
دوا تەمی پەڕەی گیان دەرچونیشیان بو بە هەورێك و،
بەسەر جیهانا ئاپورەی کێشا!
بە دەم دڵۆپەی بارانیشەوە خوێناو دەباری!
ئالای جیهان و ژیان و مەرگیان دەپێچایەوە،
هەرچی فریشتەی پەل وپۆ سست بو.
پەڵەی سزایان دەبوە هەناسەی تۆف و گەردەلول،
بە سەر ئاسمانی جیهانی شینا کەوتنە رایەڵ.
هەتا ئەم ساتەیش تەزوی جەستەیان هەر هاوار دەکات:

ژیان کاتییه.. بێ سەر و بن و بێ ناونیشانە..
بێ ناسنامە و پەساپۆرتی لەیەك دوانە،
کلاًفەی قین و گڕ لە تۆڵەی دادی ئەو تەرمانەوە!
بون بە تەمێکی سەرگەردان و وێڵ ،
هەر جار نا جارێك دەکشان بەتیژی و دەکوژانەوە،
چەند هەزار ساڵە ئەو تەمە بۆ تە قۆزاخەی مێژو
وەك تاقی کیسراو فیرعەونییەکان مۆمیا کراوە!
نە دەست و پەلی وەلی و ئەسحابە
نەگڕی نوری پێغەمبەرەکان
نە لافاوی نوح
نەیان توانیوە ئەو پەردە ونە لابەرن لەچاو"
تا لە زنجیرەی کەلەپچەی دیلی دەستی خۆرەوە
بە خوێنی گەشی ئەو پێغەمبەرەی بە نامرادی!
لە ناو دەریایا بە کەشتی شەشی ئەمریکا کوژرا؟!
بون بە کارگێکی نەشتەر ئاسایی و هەڵتۆقین لەپڕ"
بە هێزی کڵپەی ئاگردانێکی جۆشاوی خەفە،
بە لەشی وێنە جەستەی ئەیوبی رزیوما پژا،
لە ژێر تاریکی سینەی چەرچەفی شەوەزەنگەوە!
بون بە رەشماڵی تاریك خانەیەك وەك ئەم رۆژگارە:
تەنافی ئاسۆی مەرگی ناوەختەی منالی ساواو..
دایکی پڕ سۆزی خستە گەردنی شەدادییەوە!
بۆ تاقە ساتێك لە دەستی سۆزی پێغەمبەرێکا
شیرێکی دو دەم راست نەبوەوە
تا تولە رێگای رچەی شەوارەی ئەهریمەنێکی تیا بکرێتەوە؟

دنیا بێدەنگ و لاڵ و کپ وکڕ بۆتە نەشتەرێك
موسا لە کوێیە بچێتە سەر تور
هەتا پریاسکەی جیهانی شێواو بداتە دەست خوا؟
ئاگری گەروی گڕ بداتەوە
بتلێتەوە لە ناو خەڵوزی پشکۆی خامۆشا
هەتا سەراپای جیهانی شێواو وەك تور لیٚ بکات
ئیسحاق و یوسف ویەعقوب وداود چیان لیٚکرا؟
نابنە کاروان چی بە ڕێگەی شینا
موحەمەد بۆچی ناچێتە حەڕڕا؟
چاوەڕێی سیمای جوبرائیل بکات
هەتا پەیامی نوێی لیٚ وەرگرێت
ئەم تەوقە رەشە لەت و کوت بکات
بەردە خڕەکەی دایکی عیسا لەکویٚ کەوتەوە؟
هەتا نیشانەی سیحر بشکێنیٚ
کیسە لیرەکەی باخەڵی حەللاج لەکویٚ رژاوە؟
تا باجی خوێنو عارەقو گڕی لیٚ بدرێتەوە
پێڵاوەکانی حەزرەتی غەوز کام دڵەی پڕکرد
تا زەوی وشکی بیٚ ئاو بکێڵیٚ
کەرو ژنەکەی دەروێشە رەشە
بۆ زرێباری هەمو کرد بەئاو
شارێکی ون کرد لەلەپی مشتی نهێنیەکەیا
هەر نوحێك نەچو بەسەوڵی بەلەم
دو کەسی پاکیان لیٚ رزگار بکات
ئیسرافیل بۆچی لەبری باران وەحی وەرناگرێت

هەور داگرێتە سەرکۆشی زەوی
جوبرائیل بۆچی گوڵ چرۆی تازەی ناخاتە ناو دڵ
عیسایەکی تر بخاتە کۆشی مریەمێکەوە
هەزاران مریەم بە ناسۆرەوە سەریان نایەوە
بە شاراش عیسا بون بە بڵقێکی تواوەی شێواو
من عیسایەکم ئێستا لەدەشتی کاکی بە کاکی روتی بێنازا
دەگەڕێم بە دوای دایکە مریەمی بێ خۆشەویستا!
هەناسەکانم سەرپاك ون دەبن دەگەڕێنەوە!
بە دوای ئێسقانی پشتی باپیرما
نەجوبرائیل و نەهەناسەکان دەشتی مەزنەم دەکێڵنەوە،
نە هەواری چۆڵ مەرگم دەخاتە زامی سەختەوە،
کاروانێك ئەیوب لە قەسابخانەی دەشتی خاك و خۆڵ!
کرمی ناوەختیان تێوە ئاڵاوە!
ژنە شۆخەکەی ئەیوب شەوقێکە لە سەر شاپەڕی دڵی هەورەوە
قا.. قای بە چاوی تەمیان پڕاوە،
مەسیحیش لیژنەی داری بڕاوە لە کەژو کێودا
ئێشك چی گوللەی ناوەختەی خۆرە جەرگی بپێکێت
ئیمامی عەلی لە سەفی نوێژا وشك وەستاوە
چاوەڕێی وەحی قەڵای خەیبەرە
جەللادەکەیشی دەستی رەق بوە
تەمی لەبارچوی حەوا لێی داوە
عوسمانیش بە دوای زەبری خەنجەری پشتی ئەوەوە
کەشتی دەخاتە دەریای قینەوە
پێستی ئاسك لە ژێر قەڵەمی قورئان نوسینی

رووپۆی بەیاخی پێغەمبەرەکان هەڵدەداتەوە
لەگەڵ خەتێکی تازە دەست نوسیا سەد جار دەلەرزێ
بەو زەنگانەوە سروشت سەراپا بوە بە جارچی!!
لە سەر دوا پەلی دار و دەوەن و درەخت و هەورا..
ئاوازی مەرگی کردۆتە سرود!!
هەمو لە ناخی دڵی تواوە قیژە.. قیژیانە"
بۆ گیانی پاکی ئەو فریشتانە دەپاڕێنەوە "
هەناسەش بە سەر روی کەژ و کێوا بە تیژی دەکشێ
دەروازەی ونی بەهەشت و دۆزەخ دەخەنە سەرپشت"
لە پرێکیشا بەرە و تەختی خوا دەکەونە رێ!!
بۆ ئەو تەرمانەی نەخستە کۆشکی بە هەشتێکەوە!
هەتا لە باخچەی پەڕەی زێڕینی خونچەی مێژوا..
ببنە مومیای سەر خەوی قوڵی ئەفسانەی دنیا؟!
تەواوی قوللە و رێی هات و نەهات بخرێتە بەرچاو
بەژنی ئەم ژینە تۆفاناوییە ببڕێتەوە..
شیلاوگی مناڵە نەوبوکەکەی خاك بخرێتەوە سك!
ئەویش پڕ بەدەم لەگەڵ تروسکەی چاو هەڵ هێنانا،
تفی نەفرەتو سزای کۆچەری با بەناو چاوی،
جیهانی مەرگ و ئاگری گڕو دادگای سزا..
خوایە وا دنیا بۆتە دەزولەی کلافەی تێکەڵ؟
هەتا دوا پەردەی پەرچەمی ئاسمان.
تەڵخی خوێناو و وشەی سواوە!
لەبری تۆو و زاو و زێی مندالْ؟!
کرمی ئاویشم بە ملیۆنەها باڵیان گرتوە،

له سەر قەفەزەی ئاسمانی خوێنا کەوتونەتە کار!.
دەزولەی قۆزاخەی جەنگی سەرەتا دەچێننەوە،
تەرمی فریشتەشیان کردوە بەلیژنە لیژنەی چنراو،
بە دارە مەیتی دەزولەی ئاگر هەڵیان بەستوە!
بە چەقی سینەی باڵدارێکەوە گۆرانی دەڵێن..
هەتا ئادەم و حەوایش بەچاوی گریەی خوێناوی "
زەنگی نزرگا لێدەدەن بە سەر تەرمی هابیلا!!
لە کەنیسەشدا ئیبراهیم دیارە بە نەشتەرەوە
مەرگی ئیسماعیل نوێ دەکاتەوەو
کلاوخودەکەی فریا رەسیشی لێبۆتە شەپۆل
زەکەریاش لەناو شین و شەپۆڕی دەریاکەیەوە
بەچرپە چرپی ماسیو نەهەنگ و گیاندار دەدوێنێ
لەگەڵ شەپۆلا بۆتە هاوەڵی وەحی ئەو رۆژە
بەسەر تنۆکەی پاوانەی خەمیا فرمێسك دەرێژێت!!
لە سەر دوا قاڕەی ئەم جیهانەوە دەکەوێتە باز،
پێغەمبەرانیش بە دوای تەمی یەکترا رێزیان گرتوە
سەراپا رازی رابوردوی خۆیان دەگێڕنەوە!
پەڕەی تەورات و ئینجیل و قورئان"
بە ملیۆنەها لەبەر چاویانا والآ کراون!!
هەریەك چاویلکەی زەڕەی کردۆتە چاو و،
نیگا دەگرێتە رستەی مرواری..
تابلۆی گشت رەنگەش پریشك دەدات:
بونەتە سرودی گریەی ئەم سەرێنییە
دنیا بە مردو زیندۆکانییەوە بوتە دەنگی وێڵ،

له تونێلێکی سەرشێتا زەنگۆڵەی تابوت لێ‌دەدەنەوە!
گشت دەنگێك بۆتە سوێ‌ی دوکەڵی ئەو شانۆگەرییە
تاقە دەنگێکی کپ نەبێت ئێستا نایەتە بەرگوێ؟
ئەویش خامۆشی چرای ناو تاقی کۆشکی مەهدی
وەك تابوتێکی خول خولۆکەیی دەسوڕێتەوە
ئاڵای تەواوی فریشتە و وەلی‌و پێغەمبەرەکان بون بە بەیاخی
بەسەر سەرییەوە دەکروزێنەوە
ئەستۆڵی شەشیش لەپاڵیەوە وەستێنراوە..
تەنها ئاسنێکی خاڵی بێ‌گولله و تۆپ
له ژێر سیواخی تاوانا جوڵە.. جوڵ دەکات
نەهەنگیش بە نیوە نیگای کاتی‌و کۆتایی
بە هەر چوار لایا خۆی دەچەرخێنێ"
یونس سەرسینەی شەق بوی دەکێڵێ
بۆ مەرگەساتی مەهدی دەگری
پەنجەی دەخاتە کۆشکی داودەوە
کاروان چییەکان دەڵێن.. ئەم شینە:
ئاوی هەویری تاوانی رەشە نابڕێتەوە!!
سەمای تاریك خانەی کۆتایی ژینە"
دڵی فیرعەون و پیاو چاکانی پێ‌کەرت دەکرێت!
لەگەڵ دەنگی زەنگێکی ئاوارە و ونا"
چرای ژەمبوردەی جیهان دەلەرزێ و دەکوژێتەوە
هەتا گازەرەی سەرپشتی گاکەش دەبێت بەدو لەت!
کۆڵەکەی سکی زەویش دەبڕن و دەیڕمێننەوە،
گوێدرێژەکەی جەجاڵیش دێت و بە نادیاری!

پارچە قوماشی لەسەر ڕوی ڕەشا هەڵدەدرێتەوە!
لە ناو بەهەشت و وەیلیش ڕەشبەڵەك دەبێتە ئاڵا!
ژیان و مەرگیش دەبێتە ئەفسانەی خۆڵەمێشاوی!
زەویش وێنەی لبادێکی قەرەجی دەگرێتە خۆی
منیش دەبمەوە بە ئێشکگری شەوچرای مەرگ!
دەبمە کەف و سۆی تاوانی ئەرخەوانی!
دەبمە گوناهێکی پڕ داوەریوی بەرتاوە تەرزە
بە ئەیوب و مریەم و نوح و مەسیح نەدرا بێت
بە مێژوی مەرگی ئەو تەمە شومە ڕاچڵەکێمەوە.
کراسی جاوی سولەیمانم دزی و کردمە بەرم
ئێستا بومەتە پاڵەوانێك و بە هێزی سەرە مەرگەوە"
وەستاوم لەبەر کۆشکی زێڕینی خوای ئەم کەونەدا
لە بری ئەو و مانگ و ڕۆژ و کێو"
هەر سولەیمانە بە قاڕەکاندا دەزولە دەکات
سێبەری وەك و عەبای نەزانی شەوە یەك دەکشێ،
خێوەتگای خێڵی خێو و جنۆکە کۆدەکاتەوە!!
لەتاو چۆقەی ناڵەوە وەك و تەمێکی پێ‌پەتی ،
لە کەشتی شڕا سەوڵی پاشگەزی لێ‌دەدەمەوە"
دەگەڕێم بە دوای کلیلی قوڵەی قاف و واق واق
ئەویش بریسکەی ئەو خەوە زڕە لەمێشکی دراوە
کفنێکی سەوزی سپی‌و تاریکی تەڵخی پۆشیوە..
بۆتە سەر قافڵەی پەیژەی کۆنگرەی هەرە پیاو چاکان
لە هێڵی سفر وئیستواوە چاوەڕوانی حەشر و نەشرە!!
تەمی خەوەکەی نوحیش بە دوایا کەوتۆتە شەپۆل،

لە سەر دوا تەختەی کەشتی شەپۆلا بانگەواز دەکات،
دەڵێ:لە نێر و مێ دوانم خستۆتە ناو کەشتییەوە
وا جیهان بەبێ نرکەی پەری و دێو چۆڵەوانییە!!
لەگەڵ یونسیش بە دڵ دەگرین و دەکروزێنەوە!
پرسەی کۆتەڵی یەك کۆستی گەورە دەگێڕنەوە،
چاوەڕێش دەکەن خدری زنە بێتە فریایان،
هەتا لە بری دوا پێغەمبەری ڕەجاڵی برسی
خۆیان بکوژن و گۆڕێك بکەنە ئارامگای ژینیان"
ئەو گڕە بە گەردەی تیشکی خۆرەوە!
شالاو دەهێنێ بەسەرو روما..
بەدەریای سۆزی ناڵە.. ناڵەشیان گڕ دەگرەو
دەگەڕێم بە دوای تەخت و تاراجی ئەم گەردونەدا
چاوم دەبێتە تەلەسکۆبێکی بە هێزی پێنج ڕو..
هەر کە منالانی روتو پێ پەتی ڕەجاڵ دەبینم،
لە ژێر کەرەنتوی سەد ئەژدەهاکا ئەشك دەرێژن:
جیهان کەڕ دەبێت بەدەنگی تیژی دێوان و پەری،
ئەوا ئێستاش سۆفییە سولەیمانە شەپۆڕیانە!
بەیەك ئاواز سرودی پەشیمانی دەڵێنەوە!
زەویش بۆتە تەنوری وەیلی پڕ سکڵ و دوکەڵ!
هەر فریشتەیەك لە ئاسمانەوە قاچی تێبخات:
وێنەی پەپولەی بەرچرا دەبێتە بۆسۆو قەرەبروت.
ئای خوایە گیان.. ئای.. ئای!!
جیهان وێنەی نەفخی سورو سەرەتای مێژو دەداتەوە
بۆتە ریخۆڵەی سکی گورگێکی بە بەرد هەڵدراو

ڕەنگی دو ساوای لێك هەڵپژاوی کۆن دەداتەوە..
لە ناو سکێکی ژەمبوردەی شەق بو،
بومەتە سەر قافڵەی گریەی کۆن و نوێ!
هاکا بەخۆمو نەخشەی جوغرافیای سەر زەمینەوە"
گەیشتمە بەردەم قاپی کۆشکەکەت!
فۆتۆی شیلاوگی جیهانی مەرگت دەخەمە بەردەم
موەکانی لەشم دەبنە دەمی تیغێکی ئاودار
وێنەی جیهانێك بۆتە دارێکی لەڕەگ هەڵکەندراو!
ئای خوایەگیان. ئای.. ئای!!
ئەم زەمینە وەك موغناتیسی پەڕۆی ڕەشۆکییە"
دڕك و داڵ و چەقۆ و پوش و پەلآشی تێئاڵاوە!
دڵ و مێشك و خوێنی وێنەی تاوانی هەمە ڕەنگە دەداتەوە،
ئەوا موحەممەدی مەهدیش کوژرا!!
ئەستۆڵی شەشەمینی ئەمریکا لەت.. لەتی کرد
خوایە گیان!! نۆرەی کەرەنای حەشری ناکاتە،
ئەوا جەجاڵیش دەڕواو بازاڕی کۆدەکاتەوە!
کوانێ ئەو فوەی جیهان دەکاتە بێشکە و جۆلآنە؟
منیش لە ئان و ساتی کڵپەما بوم بە بورکانێك!
ئەوا بە وێنەی پڕ کارەساتی جیهانی گلآو دەتەقمەوە!!

# پشوی مەرگی جیهان

هەناسەی تیژی  شەو چرینی مەرگ“
گەردانەی سۆزی بوکی گزنگی تەڵخ کردوە!
بورکانی تیشکی داوەریوی خۆر لەمەجەنیقا.
بەگڕو بۆسۆو دوکەڵی تێزاب ئاوێنە دەبێت!
نیگای نوخشانەی نەمامی مەستی نەگەیشتە بەر!
پەنجەی ختوکەی لەمەمکی تازەی خونچە تۆراوە،
شەپقە و قاپ قاپی وەیل دەخرێتە قاچ و سەرییەوە.
فرۆشگای هیوای لەجەردە خانە بۆتە تالانی“
کۆڵەپشتی نوێی کۆچ باری سەختی لێدەدزنەوە!!
موروی نقێمی ئاڵتون پرشنگی تەمێکی کۆنە “
لەناو پاسارگەی پاییزە شینا ناگیرسێتەوە!
لوتکە سەر سنگی خستۆتە کۆشی ئاسمانی بێ پەی،
شەتاوی مەرگ مژدانەی کفنی بەسەرا دەپژێت!!
قەدو باڵاشی دارێکی روتەی ناو گەردەلولە!
گۆپکەی هەڵوەریو لەدڵی خوێناو دەگرێتە ئامێز!
بوکە بارانەی هەرەسی خاکی داچوە“
کاروانێك شۆخی خستە ئەلبومی ناو مۆزەخانە
لەتیشکێکیشا ئاسمان هێزێکی موغناتیسی یە“
وێنەی ملیارێك مۆرەغە و کەللە دەشۆرێتەوە!

لە مەشقی شارای گۆڕی شاراوەی سەر زەمینەوە،
پەڵەی قریشکە دەگاتە حەواو دێتە خوارەوە..
چەپکە گوڵ  هێشوی شەوێکی شێتە وەك پریاسکە،
بێ لق و چڵو ڕەزو باخ و مێو سەردەنێتەوە!
گیای نەمری لوقمان چڵی ناکاتی کوێستانیەکە!
بەکرێوەوە شێوەی هەناسەی مردوەکان دەدات..
هەر لەپشتێنەی ئاهەنگی گۆمی بێجێگەو وشێنا“
ڕستەی شانۆیی هەمو سەر زەمین نوێ دەبێتەوە..
سکی هەراشی ئادەمو حەواش بە نەمامێکی تازە بەخشەوە:
بۆتە پریاسکەی نهێنی خەندەی سەرلێوی شەیتان!!
لەشەش پالۆی ژین.. ئاگر بارانە.. لافاوی شینە،
جەوەندەی مەمك ناگاتە فریای کۆرپەی سەر لانکە!
پرشەی ئاگری زەوی کوڵێنەش پەتی دەسرازەی تەختەی ڕەقیانە
بە ئاگردانی مەرگی تاقانە لەو حەوایەوە،
هالاوی مردن“ چریکەی بۆسۆ“ دەکەنە گولاو!!
فریشتەکانیش بەدوای پێلەقەی جەجالێکەوە
بە تاشە بەردو تۆفو زریانا دەکشێنەوە
دەواری چاوبەست دێنن بە سینەی گەشی جیهانا:
لە نێو شەوارەی دێجوری شەما بەلایەتەوە!
ئێشکی مەهدی تازە دەگێڕن
بۆ هەڵمی سۆزی خواوەندەکانیش
هەر فاقەو تەڵەی تەلی ئەڵماسە داچەقێنراوە:
یەئجوج و مەئجوج بە تەون چنی زولقەڕنەینەوە!
چاوی خوێنکاری ژەمبوردەییان داچەقاندوە!

لە تەمی نسێی دوای عیسا ومەهدی
بێ شەوق و تیشك و گڕو دوكەڵ
سەریان خستۆتە سەرگسكی جیهان
عیسا كۆچی كرد نەگەڕایەوە!!
بەرماڵەكەشی هەڵدڕا بەسەر تەنافی شەوەكانەوە:
مەهدیش لە شەققەی باڵی كۆتایی چەرخی دایەوە
ئەوانیش بون بە پاشای سەرتەختی هەواری بێ ناو،
كوانێ تونێل و دەرگا پۆڵایی زولقەڕنینی ڕۆژ!؟
یا جەرگی ئەویش كەوتەوە بەر روی شاڵاوی مەرگ"
جیهان كۆتایی، كفنی نەوبوكی گۆڕی پۆشیوە
پەڕۆی خۆڵاوی سەر بێشكەی هیوای لە خۆی پێچاوە!
كێڵەكانیشی بەرەو ئاسمانێك راست بونەتەوە"
گوێ چیەیانە بۆ دەنگی بەرزی ئینكیرو مونكیر!
دەفتەری رەشیان بە بەردی ئەلحەدا ناوە!
كەسێك دیار نی یە.. فریشتە نیە!!
هەمو هەناوی كپیان بە بۆنی خۆڵا دەكێڵنەوە...
نركەی دەرونی پڕ لەشریخەی سەر گۆڕەكانیش،
سەوڵی ترسناك بەشاری كپا دەهێنێتەوە!
مرۆڤیش چاو و دڵ و دەماریان ریشە كێش دەكرێت"
سەرجەم بەرەگی تەختە پۆشی ون دەگیرسێنەوە.
شارای شاراوەی خۆریش كاول بو!!
ریزەی پێشینەی پێغەمبەرەكان نەهاتە كایە
ئۆردوگای تەمیان لە ئاقارێكدا كوژێنرایەوە،
ئێسك و پروسكی تۆز و خۆڵاویان نابینرێتەوە!

تابوتێك لەسەر چرینی زەمین شاڵاو دەبەستێ،
لە گۆڕستانی بێ مردوی کۆنی واق واقەوە“
بە سەر هاوینەی فریشتەیەکا دەوەستێتەوە“
لە دوایشییەوە تەنها هەناسەی مرۆی بێ گیانە!!
لە ناو باروت و دوکەڵی خۆڵەوە بەرز دەبنەوە،
زەمینیش کۆشی دایکێکی حەزە،
لەپێش کۆرپەکەی گیانی ئازیزی خۆی لەدەست داوە!
لەرزەو بروسکەی زەڕەی کەون نەبێت بۆ لایە لایەی،
شریخەی دوا سات بە ئاگرەوە لەدڵی دەدات!
ئەو تەزوە سورە دەبێتە کلپەی ئاگرێکی مەست!
هەزاران میل دور پەپولەکانی دەکاتە سوتو...
پەڕەی هەمەڕەنگ لەزوحەیلەوە“
بەگیانی پرسەی دادگەرییەوە دەبنە تۆو باران..
لەناو چاوانی سڕی خاکی  شێت هەڵدەچنەوە،
سەد خەرمان گیان لە ساتی مەرگی دوەمینەوە“
بەو تەپ و تۆزە دەبنە شەپۆڕەی دوای تابوتی رۆژ،
بە تەزوی هێزی دەریا و ئۆقیانوس،
ملیار.. بە ملیار جەلادو کوژراو دێتە دەرەوە!!!
زەینەفون ئاڵای پەنجا هەزار کەس بەرز دەکاتەوە“
کوردۆ سنگی بۆ نەشتەری ئەڵماس دەکاتەوە!
هێتلەر بە نیگای چل ملیۆن نازی
پەنجە دەگرێتە نەخشەی سپی وڵاتانی دی!
ئەسپە رەشەکەی ناپلیۆن تەنیا بە پاشە لەقە،
سەد شار دەکاتە مۆمی کوژاوەی قوراوێکی خەست!!

سەرکردەکانی بە بەیاخەوە دێنە دەرەوە،
تاقە کەشتییەك نایان گرێتە خۆ؟!
جیهانیش سەرپاك تاریك و لێڵە وێنەی دەریایەك!
پیاوکوژ بە میکرۆسکۆبی هەزار میلەوە دەڕواننە دور،
خۆڵ لەبەر چاویان دەبێتە تنۆکەی ئاوێکی نەدیو!
کوژراوەکانیش پریشکەی ئەتۆم لە چاویان دەدرێت،
جیهانیان لێدەگۆڕدرێ بە سێدارە!
بۆران و بەفر و هەور و زریان و سایەقەی سامالْ"
قریشکە و نالْە و گریە و هاوار و خەندە،
لە موروویەکا دەنگ دەدەنەوە!!
شیوەن و کوشتار دەکەنە فلیمێك،
لە ئەشکەوتێکی بەرزی پڕ شەوە دەخرێنە بەرچاو..
بۆ هەزاران سالْ دو هێزی دژ یەك؟
لەناو تۆفانی دەریای نەزانا دەسوڕێنەوە!
زەوی دەلەرزێت!
شاخ و کێو دەرمێن بەملی دەشتا!
جەجالْیش نایەت"
خۆر هەر هەلْ نایەت"
باران نابارێت،
ژینیان دەبێتە کەوچکە چایەکی تاقیگای تازە!!
هەر تنۆکە ئاو ژین دروست دەکات، خامۆشی دەکات"
تەواوی چراو گڕی پڕ کلْپەش دەکوژێتەوە!
سکی خۆر دەدڕێت ئاو دەیگرێتەوە!
لە گلْمتە خۆلْی بە دەیان خەنجەر راست دەبێتەوە

بۆ حەوا دەکشێن بەخوێناوەوە"
کەشتی جیهانیش لەپەلە قاژەی هەزاران قولا دەسوڕێتەوە،
گڕی مۆمەکەی سلێمان نەبێت قەد خامۆش نابێت!
دوای سەد هەزار ساڵ لەچاویان دەدرێت!
ئەوسا کەشتییەکەی، خەلیفەی سێیەم بەناویانا دێت"
تەنها شمشێرێك دەکاتە دیاری سنگی شەپۆلی،
لە یەك چرکەیا دەریا بەخوێنی نەدیو سور دەکات!!
هەمو دەمرن و بێ جەستە و گیان و شوێنەوار ،
کەشتیش بەخەتی دەریای بێ ئامان کەوتۆتە سەر ڕێ"
ئەوا ئەو ڕۆیشت..
دارو تەختەکەی کرا بەئاگر.. سەرپاك سوتێنرا"
ئێستا ئەستۆڵی جەنگی لە جێگەی خول دەخواتەوە،
ئەی تەختەی ڕەشی لە کوێ سوتێنرا؟!
دوکەڵ و گڕی ئاسمانی نەگرت!
تەرمەکەش نەکرا بە مەرگی ناو جزیرەی گوم
وا دێویك دەمرێت.
سێپەری ناسکیش گیانەلایانە!!
ڕەوەیەك خێویش هێڵنجی مردن سینەی پۆشیون"
گۆڕستان نییە گردی گۆڕ تەمە
تەرمەکە نەبوە پێشەنگی سوری جیهانێکی شێت،
وا ڕەشبەڵەك و ئاهەنگی خۆشی بە دەورا دەکرێت
شەپۆڕی پرسەی لە دواوە نەبو!!
کەسیش نەیزانی چۆن ڕاپێچ کرا!!
یاخود لە نسێی کۆتاییەوە کشایە دواوە:

کەفی سەرلێوی کەوتە ناو خۆڵ و داچێنرایەوە..
کرا بەتۆوی جانەوەری نوێ..
سەیرکەن پڕ دەشتاییەك توخمی یەئجوجی!
لە داری سێوی حەوای سەردەما خونچەی کردوە!
شەیتان پاسگری نوخشەی بەرهەمە،
تەنافێك حەواش لەسەر ناوشانی خۆرهەڵاتەوە "
گلێنەکانیان بە چلورەی مەرگ بۆوە بە بەفر !
سێوەکان دەخۆن سکیان برسییە!
ریخۆڵەکانیان لەتاو بێ نانی یەکیان گرتوە!
لەهەمو شتێك هەرئەوە ماوە،
ئای خوایە دیسان لەو سێوە تاڵە پڕ بەدەریایەك"
گیانی یەئجوجی لەگەرایەکا سەردەکاتەوە.
چرکە.. بەچرکە ملیۆن بەملیۆن زیاد دەکەنەوە.
زەوی خاك و خۆڵی پڕ دەبێت،
ئەوسا نەك جیهان بۆ نهێنی دی پەل دەهاونەوە،
ئاسمانیش دەگرن دەیکەن بە بنکە"
مردوەکان دەخۆن لە چاڵاوێکا!
دۆزەخ و فیردۆس دەکەنە کونجی قەلەندەرخانە،
میوانەکانیان دەخەنە گونیەی سەردەمی یوسف!
لەو دەریایەیا دەیرژێنەوە.
لە ڕاستو چەپیش سروشت خەت دەدات،
خۆر دەبەستنەوە!
مانگیش دیل دەکرێت!
ئەستێرەکانیش دەبنە گەردانەی کاغەزی قومار!

فریشتەکانیش دەکەنە مەی گێڕ!
هەورە بروسکە لەشێوە نیگای چەرخە نەوتینە،
لە سەر مێزی رەق گڕ دەگرێتەوە.
باڵدارەکانی بەهەشت دەفڕن و لە ئاسەواری:
داری سەرمێزی یاری کەرانا دەنیشنەوە!
تاقەکەی کیسراش بەهەمو لایا چرای دەسوتێت
عەبابەیلەکان بە ئاسمانەوە دەکوژرێنەوە!
جەهلیش بەردەکان خڕ دەکاتەوە و لە تورەکەی رەش “
هەموی دەگرێتە بەردە رەشەکە،
ئەوانیش یەك.. یەك دەکەونە بەرپێی داڵە کەرخۆرە!
ئەڵقە ریزی گڕ لە هەر چوار لاوە یەك دەگرێتەوە
ئەم سەر زەمینە وێنەی ژورێکی گڕاوی لێدێت؟!
لە ڕاستو چەپی شەوقی ئەجەلی لێدەدرێتەوە.
یەئجوجیش لە گۆڕەپانی تەختی بەهەشتا فت بۆڵێن دەکەن!
وا شالاویان برد!
سەر لەنۆی هاتن جیهانیان قوت دا!
ئاسمان لە لرخەی جگەرە کێشێك لوش دەدرێتەوە!
کەس نەهاتە دەنگ؟
کاروان رێی نەگرت؟
بوکە شۆخەکەی دڵی خاك و خۆڵ خۆی کردە بەربوك،
ئەویش خۆی سوتاند!
سوتاند!
هەوا گڕی گرت!
نەوت بو بەئاو!

هەور بو بەخۆڵ!
خێو بو بەمرۆڤ!
مرۆڤ بو بەتەم!
خۆڵ بو بەجامێ ئۆقیانوسی چۆڵ!
تەنها پرۆڤەی کەشتی عوسمان و شالاّوبەرانی دەریای بێناوە:
کوا چەرخی ساتی فەلەك بۆ دڵی مێژوی ئاسایی؟
چەرخ خول ناخوات.. ناسوڕێتەوە؟
جیهان وەستاوە!
هەتا شەپۆلی ئاویش قۆڕاو و لیتەی بۆگەنە!
کەشتی عوسمانیش پڕبو لەچڵپاو
هەموی هەر قوڕو تەبەقەی خەستە ناجوڵێتەوە!
هەورو ئاسمانو زەویش یەکیان گرت"
وێنەی قوڕاوی دەستکردی تازە تێکەڵ دەبنەوە!
دەبنە پەیکەری یەك جەستەی شێواو،
کوانێ سرودی مۆسیقای ژینی سەرزەمینی نوێ؟!
زریکەی مەرگی کۆتایی خنکا!
خوایە دەنگێکی هێدی ناکەیتە پیرۆزانەی خەم؟!
جیهان خامۆش بو چرای خۆشبەختی کوژێنرایەوە!
قەتارەی مەرگ.. ژیانی بێپەی هەر بەڕێوەیە"
ملیۆنێك کاروان سەرای تاریکی لەئیستیواوە"
دەرگای ئاسنیان خستۆتە سەر پشت!
تیشکێك دیار نییە؟!
ئاگر ناسوتێت؟!
وا دوا هەناسەی بوکی شۆخو شەنگ"

بەسەر روبەری دڵی پرسەیا پەخش دەبنەوە!
ئاگرەکانی وەك تەمی پشکۆ بەوزەی هێزی دینامیکەوە"
خوێنی، وەستاوم دەگوێزنەوە!
لە سەر دوا کەلی پاسەوانی ژین بوم بە تریشقە،
سروشتیش وەکو دەفتەری سپی ،
چەند ساتێکی تر لەگەڵ تەقینی دەماری لەشا"
گشت کێڵگەی ژانی جیهان دەنوسم!
خەوێکی تازە بۆ خوای ئەم کەونە دەگێڕمەوە.

# فۆتۆی جیهانی مەرگ و ژین

## جیهان ئابڵوقەی خوێن و کەرەنتوی ئادەمیزادە!

ناڵەی کۆتایی سرودی ڕەوە جنۆکەی هات و نەهاتە:
خۆر بۆ قەتارەی کاروانێکی شوم کەوتۆتە سەر ڕێ،
بەرێگەی ونی هەزار هەزارا ریشەکێش دەکرێت.
نسێی ناوەختە بۆ تاقە تیشکێك باڵا گەردانی،
پریاسکەی هیوای دڵی جیهانی گرتۆتە ئامێز..
نە پەردەی سپی و زەرد و سورو رەش، ئالآیی دەکەن
هەتا دەروازەی کاروان سەرای شەو بخەنە سەر پشت..
رەنگەکان یەك.. یەك کاڵ و تۆخ و تێر لە باوەشێکا..
کۆشکی گیان کێشی فریشتەی نەدیو دەخەنە نێو مشت..
شەو لەدەسرازەی ناڵەی بێدەنگی شەوەزەنگایە
بێشەی سامناکی موغارەی تاریك بۆتە پاسارگەی..
نەشتەری خوێناو چۆڕاوگەی لەرز بە دڵیا دێنێ

ریشاڵی موتوربە کراوە بەتاڵی قژی شێوە شەیتانێك..
ڕەوە جنۆکەش بەتەوری ئیزرائیلەوە" بون بەلەشکرێك:
داڕنی چرکەی عومری کۆتایی مردنی دەکەن،
لەگەڵ بریسکەی بەیانی دەبنە هێزێکی شەڕکەر
وەك جاڵجاڵۆکەی لەتونا دەرچو دەوری دەتەنن:
تروسکەی ئاسۆی رونیش تۆپەڵ.. تۆپەڵ
کۆچباری شەوە و خێڵی جانەوەرانە.
لە گەرمیانەوە هەتا کو کوێستان" چەرچەفی وەرزی..
ڕەشاوی نەگۆڕ دەکەن بە باڵای تیشکی خۆرەوە!!
دەوار و ڕەشماڵ لە قەرج خانەی شایی و شیوەنا،
تاو و توێی مەرگ دەکەن بەپرچی تیشکی کۆرپەوە!
تۆپە قوماشی نەگریسی ڕەشیان بە شەبەقیەوە واڵا کردوە:
وەك بازرگانی شام و حەبەشە، لە دەریای ڕەشا،
بە لەرەی پاپۆری ئاوی بار هەڵگر..
بریسکەی قوماش بە سورمەی خەوی دڵ دارەکانا دەگۆڕنەوە..
شەپۆلی شەوقی کلاو رۆژنەی گۆڕ، لەسەر ئاسمانا!!
روی ئەستێرەیان خستۆتە تەمی چاڵی قوڵەوە
لەگەڵ شریخەی تروسکەکانیش رەش دەبنەوەو
دەبنە تراویلکەی ونی بێ هیوای موچەی خۆڕایی،
وەك تازە شایی مەجنون و لەیلا بگێڕنەوە؟.
لە سەیرانی دومەڵ تەقیوا، هەزاران لاشە بنێژنەوە!
بە نوکی چەقۆی ئیبراهیمەوە سینە هەڵ بدڕێ"
یەحیا تۆو چەنی بارانی خوێی بێت..
قەلە ڕەشەکەی هابیل گۆرانی ڕەشبەڵەك بچڕێ و،

قابیلیش چۆپی شایی سەد وڵات بخاتە ناو دەست"
ئادەم و حەواش لە گوێسەبانەی فلیمێکی نوێ،
گوڵاو پرژێنی بوکێکی تازەی سەر زەوی بکەن!
هەرچی تاڵانی دوای کەشتی نوحە لە پاپۆڕێکا،
بکرێتە جیازی سەر و سامانی بوخچەی نەو بوکی..
ئاخۆ شەپۆلی شێی سەوڵی دەستی پیرۆزی مراد،
پەڵەی خوێناوی چاوی رەشپۆشێك دەسڕێتەوە!؟
کاکێشان تەمی فرمێسکی سوری خستۆتە چاو و،
بەسەر مەریخ و زوحەیل و زوهرە تکەی دەڕێژێ!!
جۆگەی هاواریش بە ڕوی شیرەکەی کاروان کوژەوە خەتی لێداوە
ئەویش نوخشانەی چەمی خوێناوی فوارەی زامی.. شایی کەرانە!
چۆپی ئازاری جیهانی مەرگ لەمەچەك دەگرێ،
تریفەی شەنگی لەناو دەریاچەی دەماری دڵی ئاسمانەوە دێ"
بەشادەماری سەرزەمینەوە شەتەك دراوە!
لەهەر دڵۆپێك.. تازە زۆردارێك دێنێتە مەیدان"
لەگەڵ سەرەتای کوشتو بڕینا زا  زێ دەکرێت"
دڵداری تازەو کۆنی حەژبەقین لەباخچەی ئەوێن گوڵ دەڕننەوە،
خاكو خۆڵەکەش بۆتە پرۆڤەی هۆڵی یاریگای تازە هەواری،
گۆپکەو دڵۆپەی نەوبوکی تازەی چاو هەڵهێنراو!!
پەڵە سپییەکان لە ڕەنگی حەفتای تورەکەی حەکیمانەوە،
بازاڕی بومی لوقمانی حەکیم دەخەنە سەرپشت!
لە خۆرهەڵاتی شەداد و جەهل و سیاوەحش دێت!
لەخۆر ئاواوەش کوڕەکەی نوحە بۆتە سەر قەتار،
باکورو باشور بۆتە هەواری میوانەکانی دۆزەخ و وەیل"

چەقی ئیستواش خاڵی ژوانی یەك گرتنەوەی كۆچ.
نیرگزە جاڕی گژوگیای هەمو چەرخە شومەكان،
هەڵدەچن بەڕوی ئاسمان و هەورا“.
رەگەكان دەبنە دەماری قین و گڕی شەهوەتی تازە باڵغێك“
بەدەزوی شینی پەڵەی نزایا دەتەننەوە!!
ئاواز و چریكەی مەل و باڵندەی خۆشخوانی كێوی،
سەدای سرودی جەنگی هیتلەریان كردۆتە مارشێك،
لەناو كارخانەی سابون مرۆڤی سێ ملیۆن تابلۆ
بە ملیۆن خەڵك دەخەنە ناوتای تەرازوی شێتی .
هەتا دوا ساتی نەغمە پاساری، چەقۆی ناوەختە
چۆن ناخی دڕی و گوڵێكی ژیكی بەخوێنەكەی ناشت..،
گوڵە عارەقەی دڕكی پاوانەی هەزار بە هەزار!
موڵكی باپیرەی دەستی زۆرداری خستە كۆشەوە
نە مەلایكەو نە پێغەمبەر و پیاو چاكەكانیش:
نەیان توانی وەكو تاجەكەی ساحێب قڕانی لە یەخەی بدەن.
ئەو گوڵە مژدەی بەری ئاواتێ باخچەیەك دەرچو:
لە كاروان سەرای مەلیك و شا یا ریشاڵ دەردەكات!
كڵاو خودەكەی هێتلەر و پا پا دەخاتە سك و“
نەخشەی تام و بۆی نۆبەرەی تازە دەكاتە سەرتۆپ“
وەك‌و جەوتێكیش بە بەژنی بەڕوا شەبقە هەڵدەگرێت“
خۆ كچەكانی دەشتی مەریوان بەشێی زرێبار“
دەرزی سنجاقیان داوە لەسنگ و بەرۆك و مەمك،
بە دەم هەناسەی جێ زامی جەرگی پەری خان و لەیل،
دەگەڕێنەوە و وێنە دەكێشن لەجەرگ و دڵا!!

کوچك و کەڵەکیش ڕێچکەی بەر نویژی دڵداری ڕێ یە،
بەپەڕۆ و ئاڵا و داری شەق و لەق:
بونەتە بۆسۆی ئاهەنگی مەرگی لانە سوتاوی،
مەلی ئاوازەی تەریوی سەر کێو!!
لە کەنارەوە بۆ سەرو ژورو قەدپاڵ و لاپاڵ،
تەپڵو مۆسیقای هەناسەی نوقمی شەپۆلی سورە"
بە گوللەی شەڕ و باروتی ڕەشی ژەنگاوی خوێناو:
تکەی چۆڕاوگەی مێشکی هەڵپژاو دەبارێتە خوار!!
چۆم و کانیا و و شەتاو و روبار سەرپاك سەرچاوەی،
قۆزاخەی تۆوی خڕۆکەی خوێنی دەماری لەشە"
لەگەڵ شەپۆلا مرۆڤ و گیان لەبەر تێکەڵاو دەکات،
ئایشەو فاتمە پرچیان قەتاری کاروانی خۆرە!
دەکشێن بە بەژنی ئەستوری دورگەی بێشێوە و نەخشە!
مقەستو داسیش هەر یەك بە دەستی شەوەیەکەوە،
نوکیان کردۆتە پزیسکی چاوی بێگەرد و جوانی!
خۆر لە یەك ژەمی سەردەقی هەمو گیرانەکانا،
خەتی ئەژدیهای دوجا، حەوت سەری تێوە ئاڵاوە!
تەمەنی چەرخی مێژوی ڕۆژگاری لیّ بۆتە ساتێك،
غەرغەرەی هەزار حەفتاو پێنج ساڵی نویّ دەکەنەوە،
لە چەرخی ساتی چاو بەستنیشیا نەفەس خەففەیە!
لە گەڵ نوزەیەك بانگەوازێکی کزی لیّدەکشیّ
داوای پیاو چاك و وەلی ناوازەی سەرانسەر دەکات،
هاواری چرکەی گۆڕینی خولی زەڕەی کەونیەتی،
چاوی تورەیی گرتۆتە مانگ و کاتژمێری خول

بۆچیٚ وەستاون و ناسورِیٚتەوە؟!
تالە سورِی مەنگ دەریایەك میکرۆب
بکریٚتە تۆزی کەفی ئاسنی تواوەی کورە
شەداد لەئاشی گەنم زیٚرِینی یوسف ئالاٚوە
پیاوەکانیشی بۆ مەرگی یەعقوب خستۆتە سەر ریٚ!.
تەنها زلیٚخا تەمی ئەفسانە لەچاوی دەدریٚ و،
ئەشکی سیواخی تەرمیٚکی ساوای بیٚلانك دەکا!
شیٚی گریەکانیش دەبنە ئەتۆم و بلاٚو دەبنەوە!!
چاوی کۆرپەکەی ئەوان کویٚر دەکات،
ئەو تەمە وەکو یاسای ماتماتیك لەو خیٚراوەوە"
نوسا بەگەردی تام و بۆی ژینی ئەم سروشتەوە!
دوای ئەوان هەرچی وەلی و پیٚغەمبەر هاتنە دنیاوە
هەمو عەینەکی زەرِەی ناکاتیان خرایە بەرچاو
هەتا گۆی زەویش لەو ئان و ساتە دروست کراوەوە"
بۆتە سەر تەختەی قوماریٚکی روت!!
سۆزانی و قەشە و جۆکەر .. بونەتە سەر پاسەوانی"
کۆرِی کاغەز و پیٚرِی بیٚ پولیان خستۆتە ئارا!
سزای جگەری هۆمیرۆسیشیان کردۆتە باجی شەوی زاوایی!
پەلەی شەهوەتیش گولدانی میٚزی کۆشکی بیٚ دوایی
چوارچیٚوەی تابلۆی زەخرەفەی فەساد ریز ریزە دەکشیٚ"
جیهان دەکەنە هۆلیٚکی خەسلەت"
کورسی نیشانەی گەورە پیاوانی سەر کەللە سەری پلیشاوەیە"
پەرداخیش ریٚچکەی شالاٚوی لەشی بیٚرەنگو تامە!
بەچکە پشیلە بەچاوی زەقی نەترەکیوەوە:

هەڵنیشتون بەسەر لێواری شوشەی زێڕ نەخشینەوە"
لە گەڵ قومێکا هەریەکی پەنجا زاو و زێی تریان لێ‌دەبێتەوە!
ناوکی پەرداخیش بەگرێی دەمارێکەوە لە زیاد بونایە!
کەرەنتوی شانی دو نێرەموکە کچ و کوڕەکەش.
بە سەر شاپەڕی تاڵی مرواری ئایشەو فاتمەوە
دروێنەی وردی شەبەقی گەشی تیشکەکەی دەکەن!
تك.. تك دڵۆپەی گەوهەری پاشا،
لە ژێر گەرداوی بێ وێنە نەخشیا رێزەی بەستوەو،
لەسەر خۆڵەکەش هەڵ دەبەزنەوەو دەچنە حەوا!
جارچی قاچاخ چی دەیگرێتەوەو دەیخاتە خەرار،
جیهانیش سەرپاك لە راست و ژوری یاری هەڵماقۆ،
دەکاتە هاوڕێی خڕۆکەی خوێنی!
دەمارەکانی دەبنە وێنەو نەخشەی سەرە مەرگ،
دڵیشی ترپەی کۆتایی جیهان لێ‌دەداتەوە!
هەر لەو ساتەیشا ئیزرائیل دێت و لەچەقی راستی سەر زەمینەوە"
شیرێك دەکاتە ئاڵای گیان کێشان.
ئەوسا خەت خەتێن لەگەڵ هیتلەر و دیغۆلا دەکات"
ئەوانیش شەپقەی رەمزی کوشتاری مرۆڤ دەکەنە سەر،
لە هەر خانەیەك نیشانەیەکی دەکەن بەکلیل"
تا لە قیڕاتا بە زەڕبێکی چەوت جیهان قفڵ دەدەن!
ئاشە تەنورەی مۆسۆلۆنیش... لەگەڵ ئیسرافیل
نوخشەی هەورێکی ئاگر بارانە!!
لە گۆمی گێژا دەخولێتەوە بە دوای چارەکەی مێژوی ژیانا"
ئای بوخچەی ژینیش کۆڵی وێڵێکی چڵکنی پیسە،

ئارەقە و ڕشکی پرچی درێژی تێوە ئالاوە!
دایکێکی دەوێت بۆ جارێکی تر بە ئاوی حەیات،
لە تەختە شۆری گەرماوی بەهەشت بیشواتەوە.
بیکاتە لانەی سەرپەلی داری منالی ساوا،
خۆ مریەم سینەی دادو بێدادی نابێتە جێ ڕم:
مەمێکی مژدەی بخاتە ناو دەم!!
بە دوای تروسکەی ئەو کوێرە ڕێیە تاریك و لێلە"
تەنها من بومە ڕێبەری گزنگ،
بە تولە ڕێگای دژوار و سەختا دەگەڕێم بە دوای هەناسەی ونی!
مریەمی چرۆی بێ دلداری یا
مستیلەی نقێم یاقوتی وردم لە ویسام بەخشی گەردون هێناوە
بیخەمە پەنجەی ئالقە نەدیوی گەوهەر ڕێزییەوە!
تا ئەو پەیکەرەی هەزاران سالە دەگەڕێ بەدوای خۆشەویستێکا!
ببێتە باوکی موسای خاك و خۆل،
باوەشم ئێستا ئەسپی بۆراقە و دەکشێ بەهەمو لایەکی کەونا!
مریەم لەکوێیە بمگرێتەوە
هەناسەکانم وەك تەمی موسا جیهانیان سوتاند!
تا کۆشکەکانی بەهەشتیش هەمو گڕیان تێبەربو
مریەم هەر نەهات
نەهات دوا گۆپکەی زامی بە روما بتەقێتەوە!
ئەوسا فوەکەی دەمی جوبرائیل ببێ بەشەپۆل
بۆلای خوای گەورە بگەڕێتەوە
لەوساتە وەختەیش بەدو بالی پەڕ بفڕم بۆ حەوا!
جیهان تەی بکەم بۆ ئەو پەلەیەی لەمریەم درا،

**ئەوا من سوتام مریەم دیار نی یە؟!**
**تاشە بتەکانی خوای یۆنانیەکان لە ژێر ئاگرا بونە پەراوێك“**
**هەمو چاوەڕێی ئیزرائیل دەکەن بلێ (بخوێنە)!**
**سەرپاك لە ناخا هەڵدڕی جەرگی شێوە مرۆڤیانە،**
**کێ دەلێ نابنە تەیرێکی باڵدار؟؟“**
**وەك عەبابیلە بەردە بارانی ئادەمیزاد بکەن“**
**گا پەرست لە ناو زریان و کرێوەی پێش هەناسەوە“**
**چەتری خواوەندی نوێیان هەڵداوە**
**ئاگر پەرستیش لە پاڵیانەوە بون بە کاروانێك،**
**بە پرشەی پزیسك قا.. قا لێدەدەن بە سەر جیهانا!!**
**ئەی کوا ئەو خوایەی ئەوان کردیانە فریا رەسی ژین؟!**
**وا کۆرپەی مریەم لەبەر شالاَوی ئەژدیهادایە**
**تەمی ئەفسانەی زویان چی لێهات؟!**
**خەرمانێك مریەم بوکە بارانەن بۆ رۆژی قاتی**
**عومەری خەتاب نامەی ناکاتە کۆچی قوربانی**
**ئەو نەوبوکانەی خرانە ناونیل**
**ئەو جادو گەرەی رەملی لافاوی کردە سەر مەشق،**
**ئەستێرەی گەشی کچانی شۆخی تیا کوژاندەوە!**
**دارستانێك بوك لەناو تەوژمی دەریای رەشەوە،**
**کرانە کەفی بێ باج و نرخ.**
**کۆسە بە کۆسەی ئەو ساڵە وەختە ئێستاش سور بوە.**
**نجوم گەرەکەش زرتو زیندوە،**
**لافاوی نیل و، دەریای ناوەڕاست سەدان شاریان برد!**
**کۆشکی کچۆڵەی دەست بەخەنەشی تیا تلیسایەوە!**

تەتەری نامەی خەلیفەی دوەم لەکوێ کوژراوە
بۆچی ناگاتە شەڕە خەنجەری خێل و هۆزی نوێ؟
تاقە کیژێکی لە تەختە بەستراو.
لە سکی رەشی نەهەنگێکی زل کەوتە خوارەوە!
نامەی خەلیفەش لە گیرفانیا بو
شێوەی دەچوە سەر چەرچەفێکی رەش"
کە ئێستا بۆتە شەبقەی ئاسنی تەمەنی مێژو!!
تەرمی پاکیشی شێوە مریەمی سالێکی دەنواند
هەمان گوناهی لە چاو نوسرابو!
ئەی مریەم بۆچی باوەشی گەرمی بۆ ناکاتەوە
ئەویش بێدلدار خرایە سنگی دەریای فرت و فێل!
چرۆی ئەوێنی لە ناو شەپۆلی گوناهی سپیا کوژێنرایەوە:
تابوتە کانیش بەخالی و خرتی رێگری سەر رێی
ئەو تاوانانەن نوسرا لەچاوی مریەم و هۆزی
شەن و کەو دەکەن لە بن کلێشەی مێژوی کۆنەوە!
لە حەشارگەیەك سەدان پێغەمبەر زیندو بونەوە
موحەمەد ئێستا بەرگی پۆشیوە
بۆ میوان داری پانسوێنی خوا
کوا حیلە حیلی ئەسپی بۆراق و
گڕی بێ رەنگی لاشەی جوبرائیل؟!
هێزێك ئەسحابەی پێ پەتی برسی
لە بەر میحرابی چاوەڕوانیا بون بەپاسەوان بە بەرمالەوە!
دەنگی تریشقەی سەرابی قسەی، گوێی سەر زەمینە
ئەوا ئەو کەڕ بو

مرۆڤیش سەرجەم گێژ و حوّل کران!
هەمو بەتارای رەنگا و ڕەنگەوە بە گۆی زەویا دەخولێنەوە!
ئەویش دایکێکی رەشی پۆشی خوێنە"
بەکلی ئاوی هەڵمی چڕ و پڕ چاویان دەرێژێت..
بە لەرزە لەرز بلێسە دەکا و گڕ دەگرێتەوە.
لە هەر پزیسکێك کۆرپەکەی موسا
لە زاو و زێدا چاو دەکاتەوە
بۆ یاسای مەشقی شانۆگەری یەك دەکەوێتە کار..
لە رستەی وردی جیهانێکی نوێ بۆتە بەرنامە"
پاڵەوانانی سەرەتای مێژو!!
هەر لەئادەمو حەواو شەیتان و ئەبوجەهلەوە
هەتا دوا تیشکی هەڵماتە شوشەی هیتلەر و دەیغۆل"
لەگەڵ شیلاوی چاوی ساوایەك"
کە ئێستا لەسەر کوێستانی ساردا بۆتە چلورە،
دەبێت لە نەخشەی جوغرافیای کەونا بکەونە پرۆڤە!
نەوەی تازە بوی مریەم بە قامچی خۆریان گرتوە
هەرکەسێك نەیەت بە تەختە سڕی ئەو منالانە
ناوی دەخرێتە سەر زاری شەوە و دەکوژێتەوە"
وا منالەکان لە هۆلی شانۆ بون بە کاوەی نوێ،
ساتێکی تریش پەردەی هۆڵەکە دادەنەوە!
گڵۆپێکی سور دەکەنە مژدەی خۆرێکی تازە!
لە سەرەتاوە شەن وخەرمانەی هاوکێشەی مرۆڤ،
دەکرێتە باربۆی پارچە سەهۆڵێك!!
تەیمور لەنگ شیشەی چلورەیەکی بەر گوێسوانەی

ماڵە مامانی خامۆش و چۆڵ و کرو کاولە!
فریشتەکانیش سەمای دەشتێکی بێ سێبەر و ئاو
لەبەر نەشتەری کارخانەی قوڕا دەتوێنەوە
لەوحەکەی دارا بە سەر دەزولەی قاڵیچەی سپی سلێمانەوە
شەڕ لەگەڵ حەرەی بێ وەحی تازە و
خانوبەرەکەی پڕ تەختە قوڕی حامورابیا هەڵدەگیرسێنێ:
زەرادەشت قامیش دەگرێتە تاشی ئەشکەوتێکی چۆڵ!
چیرۆکی دم.. دم دەنوسێتەوە!
دوایەمین چرکەی ئاگرێکی روت دەکاتە کڵپە:
لاشەی پیرۆزی لەناو خۆڵێکی نەدیوی خەما دەشارێتەوە!
موساش بەپرشەی ئەو گڕە سۆزە:
تیشکی ئاڵو وای دەبێتە شەپۆل
بە هەناسەیەك خەمی زاوایی بیر دەچێتەوە!
کەفی قامیشیش دو دۆنگی یەکی دەخاتە ناو دڵ
بەسەر مێژودا دەبێتە پرسیار..
بۆ دەستەچرکی نەخستە کۆشی نازدارێکەوە
تا ئیسماعیلێك لە نزرگایا ببێتە فەقێ؟!
ئەو بایە قوشەی پەڕەی هەواڵی دڵی رۆژگار بو"
کتێبی ئەفسانەی مناڵ کوشتنی بە فیرعەون بەخشی!
کۆرپەی ساڵێکی بە سەر بڕاوی پێ‌خستە دەریا!
ئەو دایکانەشی زاو و زێ سکی گرتبونەوە:
هەمو هەڵدڕان بە شمشێرەکەی مست و کەناری:
موسا خواوەندی ئەستێرە ناس بو،
دایکی لە ترسا خستیە سنوقی قاپ زێڕینەوە

فڕێی دایه ناو خوێنی دەریاوه!
له شەپۆلاوا بو بە سەر کردەی هەزاران کۆرپەی کەلله جیا کراو
حەوت رۆژ بە شیری پەنجە فریشتەی نەرمی خۆی ژیا
بۆچی ئاشەوان بە دیلی گرتی و خستیه کۆشکی شوشە خوێناوی:
خۆ فریشتەکان هەمو سەرپەلی ترپەی دڵی بون،
تۆی خەوێکیان بۆچی لەدڵی ئاشەوان نەچاند؟!
یاخود ئەوانیش بوبونه هێگەڵ دیالاکتیکیان کردبوه تۆوچەن
هەتا ختوکەی پەنجەی موسایان بەناوچەوانی فیرعەونا دێنا!
وردە ئاڵتونیان لێدەرنی یەوە!
بۆچی پشکۆکەی خستە ناودەم و پارچە دوڕەکەی لە گیرفان نەنا؟
فیرعەون دڵی لەقوله مشتی دێوی بژۆڵی قوللەی قافا بو.
کە بەبێ هۆشی موسای بەیار کرد“
کوا ئەو سامانەی کەوتە بەردەستی بەشوانە مەڕی،
نەبوە میراتی موسای ئەم رۆژه؟!
هەناسەم ئێستا فوی موسایەکە
بە شقارتەیەك كڵپە دەستێنێ؟!
نەك پارچە پشكۆ وردە ئاسنی ناو کورەخانه“
لەگەڵ تەرازوی دوڕو ئاگرا خراوەتە دەم!
عەقڵی فیرعەونیش لەبەر چاویانا کاغەزی کۆنە..
مناڵەکانی دوژمن خێوی من لە مەزارەوە،
هەزاران تابوت بۆتە ئوتێلی سوێی هەمیشەیی!
تا لە سەر تۆز و خۆڵ و گا بەردیش تەختەیان هەڵکەند:
کاڵا وبەرگیشیان سەرپاك دەزولەی هێزێکی ونە!
بۆ سکی سۆزی مریەم دەگەڕێت

شیلاوگی سکی له کام سەهۆڵا شەختەبەند بوە؟
تا مناڵەکان ببنە هاوەڵی..
لەسەر ترۆپکی گردی گۆڕەوە لەمردنی زەق دەڕواننەوە،
چەپڵە ڕێزانی مزگێنی رۆژی ئەم جەژنە دەکەن:
سەراپا هەمو سەمای هەڵپەڕکێی جۆشی ژینیانە:
هەتا لەدورگەی خاکێکی ونا ببنە جیهانێك،
وا گلۆپەکان دادەگیرسێن و دەکوژێنەوە!
لەگەڵ پەردەیا چرکەی ئەو زەنگە لێدەدرێتەوە،
کاروان چی یەکان لەسەر دواخەتی موشتەری یەوە،
بۆ سندوقەکەی موسای تازە بەخش گۆرانی دەڵێن
لەگەل ئاوازو مارشی بەجۆشی سەربازی شەڕا،

## مێژوی لاپەڕەی جیهانێکی سەیر دەگێڕنەوە!!

# جیهان و حەشر و لەدایك بون

سەر لەنوێ کوانوی مەنجەنیق پشکۆی دەگەشێتەوە“
له جۆشی تینا میوانی سوژدەی هەوری باڵایە،
خوایە.. کوا دەریای بەژنی تیشکی رۆژ؟
نەبو بە هەور بەسەر بڵێسەی زەوی سوتاوا داباریتەوە؟!
ئەو ئایەتانەی بۆ پێغەمبەران دەهاتنە خوارێ چیان لێکرا!
کەوتنە ناو قوڕگی کام قەله رەشەی بێ پێناسە و ڕێ؟!
جیهان له نێوان شەختە و ئاگرا بەرگی پۆشیوە،
فریشتەی هاوار بە کاغەزی مێشك نایەتە خوارێ“
دیسان شەوارەی شەوی دێجوری بێ پەناو پاسار،
پەرچەی چاو کوێری دەهاون بەسەر باڵای نیگایا،

چرای ناوباخی خوێنی ئاڵ و وا کوژێنرانەوە!
ریشاڵی فەرشی ناو تاقەکەیشی لە ڕایەڵەوە،
لکی بەدەمی مشکی تازە بو ئاخندراوە!!
بیابان سوتاو و چۆڵ و کاولە!
کێویشی بە فوی بۆراق هەسانی سافە!
کۆشکی نادیار لە ژێر زەمینی هەوری رەشەوە"
دەرگای پۆلایی دەخەنە سەرپشت.. دایدەخەنەوە،
دیقە بە دیقەی لەدایك بون و گیان کێشانێکە ،
زۆنگاوی سیحری مەرگ و ژیانی تیشکی سواوە
کۆچەری غەمبار لە دەشت و دەر و هێڵی سفرەوە
رەوەی مەرگاوییان لە پێش خۆداوە
لە هەر ئاقارێك خونچەیەکی گەش گۆپکەی بتەقێت،
بارێزەی خێو لەسەر سنگی دادەنێتەوە!
خوایە.. شەبەیخون لە ناو دەمار و لەش ودڵەوە
هێرش دەهێنێ بۆ مێشکی ونی ئەستێرەی بەرز
سەدان فریشتە دەبێت بەپەڕەی پەیامی نوێوە
لە حەوت تەبەقە بە شمشێرەوە بۆ پاسەوانی بسوڕێنەوە،
هەتاوی باربوی رۆژێکی سەختی بێجلەوی شوم،
سکڵی ناوەختەی بێپەی دەهێنێ بە لەش و لاری خۆری گیراوا
بە پەرۆیەکی ژهراوی پیسی خۆ گۆڕاوەوە!
روبەری ژیان دەکاتە مەشکەی دڕاوی شەق بو!
کارگەی هارێتی لەچقڵی بنکەی شەوەوە دەکشێ
دەواری شاری تیشکی سەرگەردان دەپێچنەوە!
ئاوەکەی دەوری سەرپاك رژێنراو کرا بەهەڵم!
خۆیشی لە لرخەی مەرگی دواییا موچڕکە دەدات!
حەوت پەردەی بەرز لەکورە خانەی ئاسن توێنە،
چەند بالاخانەی بالا بالایان دامەزراندوە!

بریسکەی گریان دەچێتە سکی نەهەنگی دەریا،
لەخواریشەوە بۆن دەمی مشك و جرجی خوێن هەڵکێش"
رەگی دەماریان گەیشتۆتە سەر دوشاخی گاکە،
ئەویش بەچرکەی ئازار کەوتۆتە ختوکەی شێتی
لە وەدایە هێلکەکەی پشتی تەواو خاپور کات.
دەماری رەشیش بەسەر بوخچەڵەی خۆڵەوە دەکشێ،
بە شانی چەپی ئەستێرەکاندا هەڵدەپژێنەوە!!
پەرێزی گزنگ گاسنی پۆڵای لێدامەزراوە،
جەرگ و ریخۆڵە و هەناوی سروشت دەکێڵنەوە..
تاقە گرێکی سۆز دەرناکەوێت
دەریایەك چڵم و کێم و خوێن و گۆشت،
لە نێو, نەشتەرگای جانەوەرەوە دەکشێ بۆ حەوا!
پەیژەی ئاسن و تەختەو تەنافیش یەك بەدوای یەکا!
بەسەر لاپاڵی مەریخ و مانگ دا هەڵپە سێردراوە!
ئاسمان سەرانسەر بۆتە سەرچاوەی بازارێکی گەرم،
پۆلە مراوی لەسەر ئەڵماسی پردی سیراتی کاتی نەبینا
رستەی ئاوازی جۆرجۆر دەکەنە سرودی پرجۆش!
بانگەوازیشیان پۆلە کۆتر و باڵندەی تیژرەوی چڵە"
دو ئاوێنەی تەڵخ لە نیگایەکا یەك دەگرنەوە،
نوخشەی گاڵتەجار بەسەر نەمامی هیوای ژیانا هەڵدەدەنەوە"
لەزۆران بازی دو پاڵەوانی گودەڵەی بێپەی
گەردون دەبێتە تەختەی رزیوی چەرخ و فەلەق
مرۆڤەکانی نیاندەرتاڵیش دەبنە قومارچی!!
کارێز و کانیاو بەفشاری توند هەڵدەمژنەوە!!
دیواری زامیش لە ژێر گاسنی بازوی دێوەوە"
بە ناڵە گوێچکەی مەملەکەتێك کەڕ دەکەنەوە!!
بایەقوش ئاسا ئەڵقەی مەرگاوی دەبەخشنەوە!

دو شاری مردو لەگۆڕستانی گاڵتەجاڕیا،
مستوی شمشێری یەك جاریان گرت !
لاگوێ گۆزروان نەسیمی مەرگی رۆژگارێکە سەخت،
دادگای کوشتن لەگەڵای چڕی پیری دەگێڕێت،
پیریش گێلاخەی عومری فریشتەی چاو شوشەی جوانە!!
لە پاشە لەقە خۆی دەخزێنێ بۆ ئۆردوگای خوا،
رەگی روەك‌و داری جوان و پیر لە دڵی سروشت"
گەڵای کفنێکی سپی و شەش گەردیان هەڵخستۆتەوە!!
لاسکی ناسك رەنگی خامۆشیان لەسەر نیشتوە"
مردویەك نییە لە لانکەی گەردەلولێکا بپێچنەوە؟!
ئەی گۆڕەکانی لاشەی خەرمانەی قەومی لوتی زو،
شەپۆلی ئاویان لە کەناراوی کام لوتکە شاخا لەنگەری گیرا!!
رەنگە بێئاسار لە دەریای سوردا توابنەوە!
نوح نەبوە بازوی گۆڕ هەڵکەنێکی جیهان بینی مەرگ!!
تا مەتۆلەکان لە ماسێتی ئاوی تاڵ و سوێر نا ئومێد بکات..
قەلە رەشەکەش لەو هەستە پاکە رو رەش مایەوە،
بۆ جارێك دەنوکی نەخستەوە ناو پەرێزی زەوی!
ئەو جەستە ئاوییە لەچەرخی خەمی زیندو بونەوە.
هەمو بەسینەی وشە زەڕاوی شاعیرێکی شێت هەڵ نیشتونەوە
قەڵەم وەك هێزی خەزانی بێهۆش لە کێلانایە"
لە سەرەتاوە لاشەی بێ پەروا کەڵەکە دەکات!
مردو شۆرەکەی هابیل کام گوڵەی لە یەخە درا؟!
بۆ بۆنی عەتری بەلوتی نەوەی سەردەمی تاڵ و توشیا نەڕشت؟
لە بری باجی سێو فرۆشتنی دایکە حەوایا!
نەبوە بارمتەی پارچە کفنێکی سپی بۆ هابیل؟!
یاخود زێڕەکەی کەوتە ناومشتی کوشتار و فەساد
جەردەکانیشی میراتەکەیان جێهێڵایەوە!

ئێستا لە لوتکەی شاری دڵداری شەپۆلاویشا،
سەرکار دادەنێن بۆ قەسابخانەی بێفلیم و جێ،
قەڵەمی دەستیان لە شەقڵی گوڵەکەر خۆرە هاتۆتە دەرێ!
بنجی جەستە بوی لە بنکی زەوی داچەقاندوە!
پەڕە بەپەڕەی سێبەری سەمای لە ناوبردنە!
قامچی کوشتاری دەستی ناحەزی ئیزرائیلێکە
تکە خوێنەکەش لەبنی قوڕی دەریاوە دەڕوات،
ئۆقیانوس هەمو فلیمی مەرگ لە شەپۆلیان دێت،
نەسیمی شاخ و سەرکەل نقێمی کفنیان پێوەیە
پاوانەی ناو گۆڕ لەخشڵی زێڕیان دەتوێنرێتەوە
جیهان بەهەمو رەنگەو بۆیەکی هاوچەرخییەوە،
خراوتە ناو تەرازویەکی هاوکێشی تیژ ڕەو،
بۆ گەورە پیاوان تراکسودی سور دوراوەتەوە!!
بۆ گچکەکانیش شین و پەمەیی و رەش و سپی و زەرد،
خۆپیشاندانی وەلی و ئەسحابە
بە بەرگی سورو رەش و قاوەیی
قەتارەی مەرگی نەزۆکیانە
لە ژێر باڵیشیان سەد سەد فریشتە باڵیان گرتوە"
یەك یەك بە تەناف لەگەڵ نابینا دەبەسترێنەوە!!
ئەو رێبوارانەی بێ سەر قەتار و هەوار ڕێ دەبڕن،
کەسێك نازانێ رودەکەنە ناو نسێی کام نزار؟!
لەچەپ و راستیش ستونی تری ئادەمیزادە:
وەك و زەوی کێڵ چاویان لێڵ بوە"
سەریان سوڕماوە خۆر هات ڕو لەچی هەوارێك دەکات؟!
قەفەزەی زەوی و ئاسمانی دوریش بێ پەراسوی رەق"
گۆشت و خوێناویان کەوتۆتە قوڕگی جانەوەر و خێو.
مرۆڤیش هەروەك گەنمی بەر بەرداش دەهاڕێتەوە!

تۆز وخۆڵیشیان دەچێتە دەمی ئەژدیهایەکی بێ گەدە،
ئەم سەر زەمینە لە چاوی عەینەکەیکەوە کپ دەنوێنێ!
لە چاوەکەی دی خرۆشانێکە مەحشەر ئاسایە!!
ریشاڵی ملیۆن ساڵی بۆتە گوڵێکی ناو باخچەی شایەك،
تك.. تك خوێناوی چاوی پڕ ئەشکی لێ دێتە خوارێ!!
لە نێو نەدیوی هەزار ملیارد هێڵ دایکێك دیارە:
نەشتەری ونی لەنێو پەنجەیا حەشار پێداوە!
دیارە چاوەڕێی کاروانی مەرگی رێبوارەکانە!
ئاخۆ کام مەنزڵ دەیان گرێتەوە؟!
بۆیە چەقۆکەی لەناو پەنجەیا توند.. توند گرتوە!
دەیەوێت جەرگی کۆرپەکەی بدڕێت"
نوکە خەنجەری نوخشەی هیوای مرۆی سەردەمە!
کۆرپەکەی دەکات بەتۆوی گەرای زاو و زێی تازە!
بۆیە بە پەچەی رەش چاوەکانی پێبەستۆتەوە!
هەتا گلێنەی مرۆی ناپاك‌و کوشتار و تاڵان نەبینێتەوە؟!
ئەگەر کاروانی پەڵە بەرکەوتوی لێبچێتە پێش"
یەکسەر ساواکەی دەکوژێتەوە!!
لە گۆڕەپانی مەرگ و ژیانا هەزار جار کوشتی!
خوێناوەکەشی دەبوەوە هەور بۆ لە دایك بون"
ملیاردێك ساڵە لەو پرۆڤەیە سەرقاڵ‌و مەستە:
هەمو سەد ساڵێك جیهانی لێدەبێ بە تەونی هەڵوەشاو،
گەرای زاو و زێ بە شەپۆلەوە بە ڕوخساریا دێت!
ئەم جارە سیمای گەردون لەچاوی سپی دەنوێنێ
هەناسەی هەڵمی چڕی دەرچونی ناخی دەرونە!
شەپۆلی ریزەی بون و نەبونی پێدەسوتێنێ!
ئێستا ناترسێ لەدەنگ‌و ناڵەی خەڵکێکی ونا!
عەباکەی کۆڕی جیهان گیرێکی موغناتیسە تیژ،

له یەك شالاّودا گێتی دەكاتە ئاوێكی خنكاو!
ساواكەی كۆشی لەبری ئەوان جیٚدەگرێتەوە“
چاوەكانیشی وەك شانۆی هەور دەگەشێتەوە!
چەند كاتێكی تر جیهان بە جارێك گسكی لیٚدەدرێت!
تەنها كۆرپەلّەی ئەو لەناو گەرمەی سەر سنگیدایە“
بەسەر روبەری ئەم سروشتەیا دێتە ئاراوە!!
لە چەند كاژێرێك جیهانێكی تر دادەمەزرێنێت!
زاوزێكانی بە تیشكی ئەتۆم چاو دەكەنەوە:
مێژوی سەد سالّی جیهانێكی نویٚ دەنوسنەوە!
ئەوا بەهەشت و دۆزەخ چۆلّ دەبێت
فریشتەكانی سەرشان هەر هەمو دەكەونە پشو
بە دەفتەرەوە دەگەڕێنەوە بۆ كۆشكی خواوەند!
ئیزرائیل چەرخی هەلّدەگیرێت و دەحەوێتەوە!
دو جیهان لەژێر پەردەی ئەفسونا یەك دەگرنەوە:
بەبیٚ پەساپۆرت!! بەبیٚ ناسنامە ریٚ كراوەیە!!

# كفن و لانكەیەكی نهێنی

وا شەتاوی سۆز كەوتە قریشكە
بەڕوی پەرچەمی ئەشكی هەورەوە گڕ دەگرێتەوە:
سەرلەنویٚ تاقی ئاسمانی مەینەت
بەسەر سروشتا داڕوخایەوە
پەلّەی بارانی تێزابی سزا
وێنەی هاوكێشەی دو كۆلارەی وێلّ،

وەك بومەلەرزە بە ئاسمانەوە
جەرگی هەناسە هەڵدەدڕێتەوە!
دوڕو جەواهیر لە مۆزەخانەی پێشینی زەمان والآ بۆتەوە
پادشای قاجار بە سەدان جۆری چەك و شمشێری
سوپای بەزیوی بۆ جەنگێکی دی پێچ دەداتەوە
رەوە ریشنەی لە مرۆڤ نەچو..
لە ئەمەریکا و قارەکانی دی بەنێرگەلەوە
پەردەی دڵ و مێشك دەخەنە کورەی باروتی شەو رەنگ،
تونێلی تاریك لە شاخ و کێوا بەریز لێدراوە،
هەموی کراونەتە قوتوی قەپاتی هەناسەی خوێن کار"
دار جگەرەیەك لە ئاسمانەوە نەفەسی شەوەی گۆڕچن پەخش دەکا
لە هەرەسێکی سەختی چاونەدیو قوڕجاری دەکرێت
بۆ ناو دۆزەخ و بەهەشت دەچێت و دەیباتە حەوا
دو جیهانی مەست لە پیاڵەی مەیا بونەتە چۆپی
تەریبی هێڵی سوپا پێشڕەوی بێ رەنگ شێوە "
دەگەڕێت بە دوای تەرازوی ونی جیهانی گوم دا
لە دوای کۆتاییوسەرەتای مێژو ئەو پەڕاو پەڕا
کەسێك نابێتە مژدە دەری بون سەردەکاتەوە!!
چاویان وەك زامی حەشیشە کێشێك دەمی قوڵ بوە!
تکە نوخشەی سەرابی هیوا گۆشتی تواوەیان پڕ ناکاتەوە!
پەل پەل پێغەمبەر لە خۆرئاواوە بە چاویلکەی سپی،
وێنەی کوێری هەزار ساڵە دیدەیان دەکوژێتەوە!
تەپ و تۆز لەناو ریزی رێبواری مۆڵ کراوی تار
دەگاتە نێوەند کۆشکی خواوەند و بە شاورێکیش دەگەڕێتەوە

ئیسرافیل لەناو قەڵای تۆپ خانەی کۆشکی خۆیەوە
فوی دەمی بۆتە ماددەیەکی وا زانیاری تازە نایدۆزێتەوە
ئاسمان وەك چری لێرەوارێکی گژوگیای نەسرەوت
بەسەر دەماری فیچقە خوێناوی ئەم زەمینەیا هەڵاو دەڕێژێت!
وەحی بێ ماوە دەخوێنێتەوە
نوح هاواریەتی لە دەست ئیسرافیل
ئیسماعیل پەنجە لە ترسی ئیبراهیم دەدات
لەگەڵ یوسفا هاوار لە دادی باپیریان دەکەن
باعەی مەڕەکەش لە دوندی گردی نەوی دێتە خوارەوە
کەمەندکێشی ئیسماعیل جەرگی قوربانی هەڵدەدڕێتەوە
پێغەمبەرەکان یەکی هەزار ساڵ دەبورێنەوە
لەناو کاروانی پێنج سەد ساڵەوە دەکەونەوە
یوسف و ئیسماعیل دەبنە باسگری جیهانی بێژوان
ئەوسا بە تەختەی خەت خۆشی مەرگ پلەی باڵایان دەنوسنەوە
پەنجا هەزار مەدالیای زێڕ دەگرنە بازو ،
پاش مەرگی سوڕاوی چەرخ بە مۆمێکەوە چاودەکەنەوە.
بە چەپۆك بەر دەبنە هەردو فریشتەی خەو لێنەکەوتو
زولقەڕنەین نەشتەر دەخاتە سنگی شاخی بێ بنار
شێوەی یەئجوجی دەگرێت لە سیمای سەگێکی ئاوی
لەگەل خشپەیەك لە ژێر ناخونی سەر پەنجەیەوە
بۆ جارێکی تر دەکەونە خەوی دە هەزار ساڵە،
لە هەزار ساڵدا یەك پرخەی مەرگ و زیندویەتی دەکەن
لە دەیەمینیان گۆی زەوی دێتە دەرەوە
لە پاش سەد چەرخ یەك دەگرێتەوە!

سروشت دەبێتە پارچە زیویێکی ناو قوڕاوی ڕەش:
لەحەبەشەشدا پارچە قوماشێك بارمتەی نابێت!
کۆرس چییەکان لەناو بەهەشتی گوڵ و گوڵزاردا
گۆرانی بەسەر باڵای کچ کوڕی دو ڕەگ دادەڵێن :
کەرەنتویەکیش لەسەر هەورەوە دەبێتە خەرمانەی شاخێکی بۆسۆ
خێڵە قەرەجی برۆو برژانگیان دادەڕێژنەوە!
لوقمان بە بارێك داو و دەرمانی پارسالیەوە"
دەکەوێتە ناو لوتی ئەشکەوتی کچو کوڕەکە!
سروشتیش هەروەك سینی بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە
لە ئاقارێك دا جیهان دەبێتە سەماخانەی ناو کۆشکی نێوەندی،
شەهوەت لە ڕەگی نێر و مێ دەچێتە بەژنی جوتە نەزۆکی!
وێنەی فوارە زەمین بە شەهوەت ئاو باران دەکرێت!
گەڵای دارەکان سێ بنە ژێر پیاڵەی مەیوهەڵدەگرن
لەگەڵ دەجوڵەی پەیکەر خێویا دایدەهێڵنەوە!!
شەهوەت دەڕژێ و لە هەمو لاوە دەپرژێتەوە!!
جیهانیش خۆی دەهاوێتە بەلەمی شەهوەت!!
لە کانیاو و کارێز کۆڕپەی شێوە دێو لەدایك دەبێت!
لە هەناسەیەك هەزار گیاندار و مرۆڤ دەسوتێت!
نیشتەجێ دەبن وەکو خاوەن ماڵ
لە هەر وڵاتێك دو هێندەی خۆیان کۆچ بار دادەگرێت.
دەواری ڕەشیش دەبێتە چەتر،
لە سەریانەوە  پۆلە بایەقوش وقەلە ڕەش دەنیشنەوە!
ریقنەش  بە مۆمی مەرگ دەگیرسێتەوە
فریشتەکانیش دەکەونە سەمای لانە روخاوی،

لەبەر سێبەری چەتری شەوەیی
دەبنە شەختەی بەر گەردەلولی قوڕاوی سەر گوم.
تەنها لەزریێی فیقەیەکەوە بانگەواز دەکەن بۆ فریشتەی گیان!
ئەویش دێتە خوار قاچی بەقوڵفی چەترەکانەوە دەبەسترێتەوە.
لەپیشی دەکەوێتە ناو دێزە و دەرخۆنەی تەلاری تازە!
بەژنی ترومپای دەریای خوێناوی لیَ پەیوەست دەکرێت،
حەوا بەقوڕی شێلراوی مرۆڤ پەردەی لیَدەکشێت
بە ماسولکەوە بەسەر برژانگدا دێنە خوارەوە،
هەر تنۆکەیان تەرمی دەعبایەك دەیکاتە پاشا!
ئای سەرگەردانی چۆڵی قوڵفەی رەش
بیابان دەبێتە ئاپورەی شاراو کێویش بیابان !
لێرەوار سکی فریشتە هەڵدەدڕێتەوە!
لە سەر لوتکەشا سەرو کەللەیان دەبێتە پێستەی دەباخانەیەك،
لە چەند خولێکا زەوی دەگاتە حەوای بیَ ژوان:
خاك لەچوار لاوە دەسوڕێتەوە!!
لە ژێر هەناسەی پەردەی کۆتایی
تەمێکی سپی لە شەپۆلاودا بریسکە دەدات"
بە دوای بەرماڵی شارای مرۆڤی کەون لە سەرەتاوە،
فویەك جیهان دەخاتە ناو دەریایەکی بیَ شارستانی"
دوای چەند کاژێرێك نهێنییەکی نوی دەردەخاتەوە!
سەراپا گەردون دەکەوێتە سەر ملە قوتەی مەرگ!
مەرگێکی کاتی لەئیستواوە دوا پەردەی هەڵمی چڕ دەگرێتەوە!!
نیگا لە پرسیار.. کۆتایی پرسیار دەبێتە گوڵێك
خەنجەرێکی زیو دەکەوێتە کار!

پەردەی زەمین و ئاسمان و کەنار هەڵدەدرێتەوە
پارچەی سەوز لەگەڵ سورو قاوەیی لە یەك دەدورێت،
دوای ژەم بوردەیی رەوەیەك منداڵ،
دێنە سەر تەپکەی شارای نەزانی پرۆڤەی یاری!
گرێی کراوەی گەردون بەدو ڕو لەچەپڵە ریزدا“
مۆسیقای دڵ بزوێنەریان بەسەرا لێدەدات!
مەلۆکان لە دەشتاییا باوەش لە هیوای گوڵ دەنێن
پەردەی لادراو شەپۆلاوی خۆی شالاو پێدەدات
سەماش کۆشکی سپییە ئاوڕێژەکانی گرتوە!!
ئەو فریشتانەی لەسەر شانەوە فڕینە ناو تونێلی بێ تیشك
بۆ نایەنە خوار لەناو ئاهەنگی تازە جۆش هێنەر؟!
وا نهێنییەکە دەکەوێتە ناو شانۆی کۆتایی و دوایی،
کێ پرسیاری کردۆتە نامەی خوداوەند لە زەوی!
با بێت ببێتە کۆترێکی سپی
خوایە گیان..کەوتوینەتە ناو کێڵگەی ژەم بوردەی ژیانی کاتی!
فریشتەیەکی پەیامنێری نوێ ببێتە نوێنەر
ڤیستیڤاڵەکە لەئانو ساتی کۆتایی دایە،
کاتژمێری سفر بو کە بارانەی دو جیهان دەکرێت!